

ئێمە بە یەکجاری ئەوە دەدەینە دوواوە کە پێ ی دەڵێن پەرەپێدانی هوکمی زاتی بەرەو جیابوونەوە نەهێنیتان.. لێ ناشارینەوە کە دەڵێین هەڵسوکەوتمان ئەو باوەڕەوەیە کە برایەتیەکمان دەوێ هەتا سەر بێ نەک برایتیەک شیاوی جیابوونەوە بێ..

سەرۆکی فەرماندە
صدام حسین

## لەم ژمارەیەدا



دەرهێنانی هونەری: آمنی محمد غلام


# رۆشنبیری نوێ

گۆڤاریکی وەرزی لێکۆڵینەوەیە
دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی
کوردی دەری دەکات

بەرێوەبەری گشتی و
سەرنووسەر
**خالد خوشناو**

جێگری سەرنووسەر
**د. فؤاد حسین أحمد**
بەرێوەبەری نووسین
**سمیرة محمد علي**

# دەست لە دەست و هیممەت لەخوا



جالال خۆشناو
سەرنووسەر

دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی، یەکێکە لەو دەزگا گرنگانەی، کە بایەخێکی تەواوی پێدادەدرێ وئەلبەتە بەگوێرەی بارو دۆخی گشتی تایبەتی ئەمڕۆشەوە بێ گومان درێغی لێ نەکراوەو ناکرێت و، ئەوەتا چالاکی یەکانی دەزگاکەتان بێ ووچان هەربەردەوامەو، بلاوکراوەو گۆڤارەکانی مەیانیان بەجێ نەهێشتووەو هەر خۆشیان شۆرەسواری لێهاتووی رۆشنبیرین و شوێنەواری ئیجابی یان بەسەر سەرانسەری گۆرەپانی بەرینەوە دیارەو تەنانەت جێگای تایبەتی و پیرۆزی خۆی هەیە بەلای تەواوی توێژی رۆشنبیران و خوێنەرانی هێژاوە، هەر بۆیە دەزگاو بلاوکراوەکانی قەلاو قوولەیەکی بالأن و بەردی بناغەی پتەویان، خودی رۆشنبیری کوردەو بەسەر شانی ئەوانەوە ئەم کێوە بەجۆش و پرتەو چالاکە، بەرەو ئاسمانی شین و ساف و بێ گەردی عیراقی خۆشەویستمان هەلچووەو، هانای موژدەی بەرەو خپلەی خۆری داهاتووی پرشنگداری گەلی کوردو تەواوی گەلی عیراقمان دەبات.

بێ گومان گۆڤاری «رۆشنبیری نوێ»یش یەکێکە لەو کۆلەکە پتەوو تۆخمەو پایە بلندو هەنگاو چەسپاوانەی ئەمڕۆی رۆشنبیری کوردو رۆشنبیرانی کوردمان. . . کە هەر ژمارەیەکی چاوی ژیان، بەژیان هەلدێنێ، تەنها خستنە سەرو کەلەکەکردنی ژمارەیەکی رەهاو پەتی نی یە، بەلکو بەراستی، دەستکەوتێکی رۆشنبیری یەو بەشانازی یەوە دەخرێتە پال سامان و زەخیرەو گەنجینەی لایەنەکانی زانست و، زانیاری و، ئەدەب و، کەلەپوورو، فۆلکلۆرو مێژوو، و تەواوی رۆشنبیری کوردمان و دەبێتە سەرچاوەیەکی سازگارو باوەرپێکراوی راست و رەوانی ئێستاو داهاتوو، و گەنجینەیەکی لەبن نەهاتووی ئەمڕۆو دواڕۆژی نەوەی نوێی کوردو مرۆڤایەتی. هەربۆیە لێرەدا دەمانەوێ پشت بە ووتە دانسقەو نەستەق و پر واتاو ژیرەکەی کوردەوە ببەستین، کە دەلێ: ـ «هەموو رێگایەك بۆ بانە دەچێت»، ئیمەش دەلێین، ئەگەر چی جیاوازی بیرو باوەرو رەوت هەبێت، کەئەمەش دیاردەیەکی پاك و نیشانەی تەندروستی تەواوی باری رۆشنبیری و رۆشنبیرانی کوردە، بەلأم بێ گومان، هەمووان لەپێناوی خزمەت گوزاری. رۆشنبیری گەلەکەمان دەکۆشین و هەول و تەقەللای بێ ووچانی بۆ دەدەین و شەونخونی لەپێناوی دا دەچێژین، وەلەئەنجامدا زادەی بیرو دروست کراوی خۆش و جەوهەری دەست و خامەو نووکی بە پێزی لەبن نەهاتووی پێنووسمان بەرەو یەك دەریای بێ پایان دەچۆرێنن و لەیەك خاکی بێ گەردو بەپیت و پێزو ئمامی سەوزی بیروهۆشی مرۆڤایەتی دەچێنین.

لاپەرەکانی «رۆشنبیری نوێ» تان هەمیشە والأوکراوەیەو بەپەرۆشەوە، پێشوازی لە هەر بەرهەمێکی چاك و پوخت و سفت دەکات، کە شتێکی نوێ تۆماربکات و گەوهەرێکی تر بخاتە تەك سامانی زانیاری و زانست و ئەدەب و. . ی نەتەوەکەمان و، کاری پەرەپێدان و گەشەکردنی ئەو کۆترە ئەشمیلە، ئەرکی هەموانەو پێویستە لەسەرمان درێغی و کەم تەرخەمی لەئاستیدا نەکەین و بەبەرهەمی بەسوود بیرازێننەوەو بەبێ ئەوەی ووشەی من و تۆو ئەم و ئەو بخەینە پێش چاو چونکە رۆشنبیری لەوە گەلێك بلندترەو، ئەوەی بەردەوام نەبێ ئەوا بێ گومان لەرەوتی بێ ووچانی گشتی دوادەکەوێت و، خوانەخواستە ناوی کوێردەبێتەوە جارێکی تریش دەلێن لاپەرەکانی گۆڤارەکەتان بێ جیاوازی بۆهەمووان والأیەو چاوەرێی پێنووستانە جا لەهەر کوێی یەکی ولأتدابن، یالە هەر ئاست و شوێنێکدابن ئەرکی نەتەوایەتی و نیشتمانیتی خۆتان بەجێ بێنن و، . . . . دەست لە دەست و هیممەت لەخوا.

# ئەمەریکا تاکەی یاری بە وڵاتان دەکات

سمیرة محمد علي

سیاسەت زانستە، داب و دەستوورو باوەڕی خۆی هەیەو یاساو ڕێسازو ڕێنمایی هەڵ دەسووڕێنێ کە چالاکی کاریگەری تێدا ببینرێ.

ڕژێمی حکومەت یا دەوڵەت ئاراستەی دەکات و دەیخاتە کارو هەروا وەزارەتی دەرەوە هاوبەشی تێدا دەکات زیاد لەمەش چەند لایەنێکی دی زانستی و فیکری راوێژکاران کەوا لە کاری دروستکردنی بڕیارو بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەت بەشداری دەکەن بۆ مەبەستی پێکاوو بۆ هێنانەدیی ئامانجەکانی گەل و دەوڵەت. هەرچی ئەو سیاسەتەیە لوتکەی بووو بیروباوەڕی بەجێ هێنا ئەگەر کەسی بێ یا دەستە یا ئەنجوومەن بە ڕێوەی بردو جڵەوی بەدەستەوە گرت و هەڵسوکەوتی مرۆڤایەتی و ڕەوشتی چاك و زانستانەی نواند، ئەوە سیاسەتێکی چاك و بەرچاو دەبێ، بە ناوەرۆك و شێوەوە.. بەڵام ئەگەر پێتو پێچەوانەی ئەمە ڕووی دا ئەوە دەگۆڕدرێتەوە یارییەکی سیاسی مەبەستی چەپەڵ خەملەدەکات بۆ دەسەڵات گرتنە دەست و هێنانەدیی بەرژەوەندییە تایبەتییەکانیان.

ئەم حاڵەتە بەسەر فیکری سیاسی ئەمەریکی دەرکەوتووە، دەبینین جارێ ئاگری شەڕ هەڵدەگیرسێنێ و جارێکی دی کێشە دەخوڵقێنێ.. یا لە لایەکی دیەوە ئاشووب و کودەتا دروست دەکات و هاتیان دەداو پشتگیری بەرهەڵستکاران دەکات یا گیانی مەعنەوی دانیشتوانی لاوازو بێ هێز دەکات وایان لێ دەکات باوەڕیان بە خۆیان نەمێنێ و باوەڕیان بە دەوروبەر نەمێنێ لە ڕێگەی وروژاندنی جیاوازی ڕەگەزی نەتەوەیی و گیروگرفتی تایفەگەری.

گشت ئەمانە بە گوێرەی سیاسەتێك هەڵ دەسووڕێنرێ کەوا هێزێك پشتگیری دەکات و پشتیوانی دەکات و دبلوماسیەتیش لەلایەکی دیەوە سەرکەوتووی دەکات هەموو شتێك بە گوێرەی یارییێك دەبرێتەڕێوە کە نەخشەی بۆ کێشراوەو لە دوو توێیدا فێڵ و درۆو دەلەسەو چەواشەکردن خەملەدەکات.

ئەمەش ڕاستی یەکە لە ڕاستی یەکانی مێژووی سیاسی ئەو دەوڵەتە کە ئەمەریکایە.

هەروا سیاسەتی ناوبراوی بە سیستەمی ئەمەریکی لە ڕێگەی چالاکی کاولکاری لە شێوەو شێوازی هەمە جۆر دەگرێتەوە، شێوازی سەربازی لە پێشەکی ئەو شێوازانەیە، چونکە مەترسی یەکی گەورەی لە دوادایەو کاردەکاتە سەر هێزەکانی چەکدار بە پلەی یەکەم و هەروا کارلێکەری دەبێ بەسەر ئابووری وڵات بە پلەی دووەم دا لەوانەشە شێوازی دوژمنکاری و دەستدرێژکاری چەکدارو گەمارۆی عەسکەری بگرێتە بەر، یا بە شێوازی هەڕەشەی سەربازی یا شێوازی یارمەتیدانی ئابووری بۆ هێنانە دیی مەبەستی چەپەڵی یاخود شێوازی جەخت کردن بەسەر ڕێکخراوەکانی ئابووری بۆ ئەوەی جەخت بکاتە سەر ئەو دەوڵەتەی مەبەستیەتی یاڵەوەیەدەست دەکات بە بلوك کردنی پارەی ئەو وڵاتە لە بانقە جیهانییەکان و لە زۆر شتی پێویستی ژیان بێ بەشی دەکات.. یا دەستی بەسەر رادەگرێ و دەست دەکات بە تێکشکاندنی ئامانجەکانی ئابووری ستراتیژی دەوڵەت لە ڕێگەی بەکارهێنانی جۆرەها شێوازو ڕێگە کە پێویستە بەکاربهێنرێ، جگەلە شێوازی دی.. هەروا چالاکی کاولکاری و تێکشکاندنی لەوانەیە شێوەیەکی سیاسی بگرێتەوە بە کاری جەخت کردن بەسەر ئەو ڕژێمە یا ئەو دەوڵەتەی مەبەستیانە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ، ئەویش بۆ مل کەچی کردنی بۆ گۆڕینی سیاسەتی ئەو وڵاتە بە شێوەیەك بێ کە لەگەڵ سیاسەتەکەی بگونجێ کە سیاسەتی ئەمەریکی یەو نەخشەی بۆ کێشاوە یا پەنابەرێتە بەر وروژاندنی جیاوازی لە نێو ڕۆڵەکانی یەك گەل و هەوڵدان بۆ پارچەکردنی ئەو وڵاتە لە ڕووی جوغرافی یا نەتەوەیی یەوە یاخود دان نەنان بە حکومەتی شەرعی وڵاتەکە هەروا هەوڵ دەدات وڵاتەکان بەرەو لای خۆی ڕابکێشێ بۆ چوونە ڕیزی پەیمانەکانی سیاسی و ئابووریی وفیکری.. ئەمانەش بە پێی پلانی نەخشەکێشراو بەجێ دەهێنرێ، بۆ هێنانەدی بە رژەوەندیە گڵاوەکانی لێرەدا دەزگاکانی یارمەتی دەدەن بۆ ئەم مەبەستە بە گوێرەی نەخشەیەکی سیاسی کە بۆی دانراوەو مەودای ستراتیژی هەیە. هەروا گۆڕەپانی چالاکی یەکانیان، لەو وڵاتانەیە کە سیادەت و سەربەخۆیی و حکومەت و ڕژێمیان هەیە.. وڵاتانێکن چالاکی فیکرو زانستی یان هەیە، خاوەنی پایەو پلەیەکی کۆمەڵایەتی و ئینسانین.. وڵاتانێکن خاوەنی خەبات و تێکۆشانی دوورو درێژو خاوەنی مێژوو شارستانیەتن، وڵاتانی پەرەئەستێنن، خاوەنی پایەو پلەن و سەربەخۆیی و سەقامگیری بە خۆیان دەبینن.

لەوێرا هەمیشە یارییێك بووە یارییەکی سیاسی لە پێشدایە ئەگەرەو تەنکوچەڵمەی لە بەردەم پێشکەوتن و ئازادکردنی ئەو وڵاتانە دانراوە.. لەبەردەم مێژوو شارستانیەتی ئەو وڵاتانە.. یارییەکی سیاسی یە کەوا نەخشەی بۆ کێشراوە لە لایەن ئەو وڵاتانەی چەکی وێرانکەریان هەیە، تەنها ئەو چەکەیە کەوا هەڕەشەی مرۆڤی پێ دەکەن..

لە ڕاستی دا هەڕەشە تەنها لە خۆیان دەکەن و بە ئامانج ناگەن و ڕیسوابوون بەشیان دەبێ. یارییەکە سیاسی و بەدڕەوشتی سیاسەتی ئەمەریکا دەگەیەنێ دەرهەق ئەو وڵاتانەی دەڕوانە ژیانێکی چاکترو سەقامگیری.

سیاسەتێکە کەوا تەنها ئەو کەسانە بەکاری دەهێنن کە دڕندەن و لە کۆمەڵی مرۆڤایەتی دوورن و بەهای مرۆڤایەتی نازانن بەڵام ئەم جۆرە کەسانە پەشیمانی بەشیان دەبێ و مەگەر هەر پەنجەی خۆیان بگەزن و مایەپووچیان تواڵش بێت.

عیراقێك صدام حسین سەرکردەی بێ، ئەوە قەڵایەکی پتەوە وهەمیشە سەربەرزەو بەگشت هێز یەکیەوە بەرەنگاری دوژمنان دەبێتەوە.



# ئەکتەر لەبزوتنەوەی شانۆی کوردیدا

● عبدالعزیز صابر زەنگنە

## سەرەتا

باڵەوەوە دەست پێ بکەین کە گشت لایەنە هونەریەکانی شانۆ ئەتوانرێ سەربەخۆ لێ یان بکەوینە دوان و دەرگای دیراسەکردنیان لەسەر یەکالا بکەینەوە. بەمەرجێ. نووسین و بۆچوونەکانمان راستگوبن و بەقەد قەوارەی بزووتنەوە شانۆی یەکەمان بێ، بەبێ زل کردنی نارەوای واقیعەکەی شانۆمان یان دابرین و یەکەم لێ روانینی لەهەردوو حاڵەتەکەدا، وابزانم کەسانی خاوەن ئەزموونی هونەری کریکاری بوارەکە خۆی، بەو کارە هەڵسن. چاکترەلە بۆچوون و بیروڕای ئەو کەسانەی کەدوورن لە پراکتیکی مەسەلەکە، هەر بۆیە، لەکزی قەڵەمی درامانووسی کورد، لەکەمی و نەبونی هەڵسەنگاندنی ئەوکارە درامی یانەدا، ئەگەر کارگەرانی بزوتنەوە شانۆییەکەش، هەرجارە، یەکێ لەوبابەتانەی شانۆی کوردیمان بخەنە بەرتیشکی رەخنەلێ گرتنی کرووست کەرو، هەندێکیان لەسەرخوانی پر لە موناقەشەو رازهەڵرشتن کوێیەوە، ئەوا بەدەوری خۆیان شتێك لەسەر بزوتنەوەکە زیاد ئەکەن و ئەبنە هۆیەکی باش، لەروونکردنەوەی جەمسەرە هونەریەکان، لەلایەنی هونەرمەندەکان و گەیاندنی بەرهەمی رەنجی خۆیان بەبینەران... کەواتا لەسەر رۆ شنایی ئەو رایانەی سەرەوە، یامن لە خۆمەوە دەست پێ بکەم و وەك ئەکتەرێك لەدەوری ئەکتەرێکی شانوویی بدوێم بەهیوای خزمەتی شانۆی کوردیمان بگەینم.

سەرەتا، با ئەو حەقیقەتە بزانین کە (ئەکتەر) وەك مرۆڤێکی خاوەن بەهرەو توانا، لەسەرەتای تەمەنیەوە ئەکتەرنیەو هەموو ئەکتەرێك لەکاتێکی دیاری کراوی یاریدەدەردا، بواری تەقینەوەی بەهرەو ئاواتەکانی قاڵ کردنی ئەو بەهرەیەی بۆ ئەلوێ، هەر بەمەش ئاکام مسۆگەر ناکرێ، بەڵکو بەردەوامی لە پێشخستنی بەهرە کە ئەیتە بنچینەو رووکردنە جیهانی نوێ و بەرزاوانی ئەولۆ کەمژدەدانی بینای ئەکتەری بەتوانا بەسەلیقەی تیادا ببینرێتەوە... هەربۆیە دەیان ئەکتەری کورد ئەبینین، سەرەتای دەرکەوتنیان و کارکردنیان گەرم و گوڕ بووەو هەرهەموو تواندنەکانیان پاك و سەرکەوتوو بووە، بەڵام دواکەوتنی لەکاروانی رۆشنبیری و خۆفێرکردن و مەشق کردن، بووەتە دواکەوتنی بەهرەکەی و سەرەتاو دەرکەوتنی ئەکتەری لاوی رۆشنبیرو مەشق کەر بووەتە هۆی کوژانەوەی چرای تواناو وەستانی ئەو ئەکتەرانەی پێشوو... دەوری ئەکتەر لەشانۆدا، لەدەوری رەسم کردنی کارەکتەرەکانی نووسەرەوە دەست پێ ئەکات، ناسینی زیاتری کاراکتەرەکەش، بێ گومان، بەهۆی نووسەری دووەمی شانۆگەری یەکەوەئەبێ کە (دەرهێنەر) لە لای ئیمە هەر لە بیستەکانەوە کەسەرەتای خۆ ناسینی و خۆکوتانی شانۆیە بۆ ناوریزەکانی جەماوەر، ئەکتەر ویستویە بیێتە پردێ بۆ گەیاندنی و وتەورازی نووسەر بەچاوو گوێ ی خەڵکەکە... بەڵام لەسەرەتادا هەر گەیاندنەکە بووەو هیچی تر، دەوری دەرهێنەری راستەقینە نەبینراوەتەوە بگرە «دەرهێنەر» هەر نەبووەو ئەو کەسەی لەنیو ئەکتەرەکاندا زیاتر چاوکراوەو ووریا تربووە دەوری دەرهێنانیشی پێ سپێرراوە... بەڵام لەدوای ساڵانی حەفتاوە کە تەوژمی بەرەوپێشکەوتن و ئاساندنی (هونەر شانۆی کوردی) زیاتر کارە هونەرییەکانی گرتەوە، کۆمەڵێ ئەکتەری لاو هاتنە بوارەکەوە کە هەریەکەیان لە شوێنی خۆیانەوە کەوتنە خزمەتکردنی دەقەکان و بەگیانێکی لە خۆبووردوانەوە هاتنە ناوکۆڕی بەرهەم و کارکردنەوە، ئەمرۆ هەندێك ئەکتەری کەمان هەن کە بەشداری دانانی پرۆگرامی کارە هونەریەکان ئەکەن کەئەمەش خۆی لەخۆیدا مزگێنی دانی درووستێ بوونی شانۆیەکی زانستی یە...

گەلێك جار چەند ئەکتەرێك لە کۆری لێکۆڵینەوەو موناقەشەدا ئاشنای خۆیان بەشانۆ دەردەبرن ئاگاداری خۆیان لە قوتابخانەکانی نواندن و دەرهێنان لە واقیعی شانۆو پێشرەوانی شانۆ کە هەر هەموو ئەو خاڵانە ئەرکی سەرشانیانەو ئازایەتی یەکی ئەوتۆی یە کە بیکەن لەگەڵ خۆیاندا. بەڵام لەپێشبرکێ و دەرخستنی واقیعی مێشك و بەرهەمی ئەکتەری بێ توانا ونەخویندەواردا پێشکەوتوون و ئەتوانن چاکترو زووتر لەو هیچ لەبارا نەبووانە رەگی خۆیان بە زەمینەی بزوتنەوە هونەریەکەدا داکوتن وببنە هۆی دەرپەراندنی ئەو کەسانەی بەهەڵە هاتونەتە ناو دنیای بەرینی شانووە...

ئەوەی لای من زیاتر گرنگە هەڵبژاردنی ئەکتەرەکە هەڵبژاردنێکی مەوزوعیانەی هەموو هۆکانی درووست بوون و گەیاندنی شانوگەرییەکە، هەر لە

(١) هەڵبژاردنی تیپە شانۆییەکەو. بیرکردنەوەو، ریبازی ئەو تیپە، کەسانی بەریوەبەرو، دامەزرینەری تیپەکە، ئامانج و واقیعی تیپەکە، کە ئەمەیان خاڵی سەرەکیەو پێویستە لێرەوە هۆشیاری ئەکتەری کورد رەنگە بداتەوە ـ دوای هەڵبژاردنی تیپەکەو.

(٢) لەهەڵبژاردنی دەقی بریار لەسەر دراوو موعامەلە لەگەڵ ئەو دەقەدا بەچاوکراوەیی و ئازایەتی یەکی زۆرەوە لەهەمان کاتدا بەترسێکی زۆرەوە لەهەڵبژاردنیا. چونکە وفیکری ـ ئەو دەقەی لەخزمەتی میللەتدا نەبێ. لەخزمەتی شانۆو ئەکتەرەکەشدا نیە. با شیوەو هەیکەلەکەش

هەموو قەشەنگی و جوانی یەکی تیابی».

(۳) هەلبژاردنی ئەکتەر ـ دەرهێنەر هەر لەناسینی بیر کردنەوەو رەوشتی هونەری و ئیلتزامی دەرهێنەرەکەوە تائیسلوبی کارکردنی لەگەل ئەکتەرەکاندا چونکە ئەکتەر ئەوکاتە بەئاکامی سەرکەوتنی شاد ئەبی و لەنێو رێزو خۆشەویستی بینەرانی دا نوقم ئەبی، کە خاوەنی دەرهێنەری یە سەلیقەو هۆشیارو مامۆستایی.

(٤) هەلبژاردنی ئەکتەردا. هەلبژاردنی دەوروکاراکتەری شانۆگەری یەکە ئەمیشیان بەهای لەوانی تر کەم تر نی یە چونکە گرنگیەتی دەورخۆدۆزینەوەی ئەکتەریشیان ئەنی لەشانۆگەری دا خۆبینینەوەی ئەزمونی ئەکتەر لەم خالەدایە گەر ئەکتەری توانای کاراکتەری گونجاو بۆ خۆی دەست نیشان بکاو زیرەکانە بتوانی خۆی لەگەل هەرسێ مەوداکەی (دەروونی و کۆمەلایەتی وسروشتی یان لەشی) یەکەدا ئەوا سەرکەوتن لەبەرژەوەندی و لایەنی ئەکتەرەکە ئەبی بەلام لای ئیمە تا ئیستا هەلبژاردنی دەرهێنەر ئەبێتە خولقاندنی ئەکتەرەکان و پرۆگرامی تواندن لەبەرهەمەکاندا. ئەگەر هەلبژاردنەکە لەلایەنی هەردووکیانەوە بی (واتە دەرهێنەرو ئەکتەر) ئەوا بی شك سەرەتای داهێنان و جوانی لەکارەکەدا نزیك ئەبێتەوە.

وابزانم دەوری ئەکتەر گەلیك گرنگترە لەوەی کەئیمە تا ئەمرۆ بۆی چووین تەنها زۆر لە خۆ کردن و خوهێنان و بردن و ختوکەدانی بینەر بەسی نی یە بۆ ئەکتەری راستەقیە، چونکە. دەوری ئەکتەری سەرکە وتولە قەناعەت پی کردنی بینەردایە بەرامبەر بابەتێکی دیاری کراو..

بریخت لەو باریەوە ئەلی:ـ (هەر گەلۆریك بچێتە سەر شانۆ ئەتوانی کەم تازۆر بینەربخاتە پیکەنین یا خود گریان بەلام گرنگ ئەوەیە کە ئەکتەر بتوانی بیانکاتەخاوەنی هەلویست.....). لە کۆتاییدا بە دلێکی پر لە خۆشەویستی و گەشبینی یەوە رووی دەممان ئەکەینە هاوری ئەکتەرە کوردەکانمان وئەلین:ـ

(۱) ئەکتەری کوردی سەرکەوتووە گەر دەستی مایەی بەهرەو توانای هەبوو ئەوکاتە سەرکەوتووئەبی چونکە ئەکتەری بی بەهرە هیچی ئەوتۆی پی ناکری و وەك ستانسلافسکی ئەلی:ـ (ئەو ئەکتەرەی بەهرەی نەبوو چاکتەر وایە زووتر تەختەی شانۆکە بەجی بیلی و ئاژاوەنەنێتەوە).

(۲) ئەکتەری کوردی و خوینەوارو هۆشیار ئەبی بەردەوام کەشتی خۆی بەرەو رۆخەکانی کتیبخانەو خویندنەوە ناوبدات تالەئامیزی فیربوون و رۆشنبیری شانۆییدا خۆی ئەبینێتەوە...

(۳) مەشقی بەردەوام و گەران بەدوای لەش لەبارتر کردن و پیشخستنی دەنگ دا ـ مەشق کردنە بۆ خولقاندنی توانای رەسەن کە ئەمەشیان خۆی لە خۆیدا خالێکی گرنگە لەبەرەو رەسەنی بردنی شانۆی کوردی...

گۆڤاری پاشکوی شۆرشی کشتوکال

# بۆ ئاگاداریی نووسەرانی ئازیز

بۆ هەموو ئەو براو خوشکە ئازیزە رۆشنبیرو نووسەرانەی بەرهەمەکانیان ئەنیرن بۆ ئەم گۆڤارە بۆ بلاوکردنەوە.

بە نیازی ئەوەی گۆڤارەکەمان بەپێی راورەسمی ئەکادیمی دەربچی و ئەو مەرجانەی تیا بینەدی کە لە گۆڤارە ئەکادیمی یەکانا چاودیری ئەکرین، داواتان لی ئەکەین هەمیشە ئەم خالانەتان لە بەرچاو بن:

۱ ـ ئاگاداریی نووسینی ناوی سەرچاوەو خاوەنەکەی و ژمارەی بەرگی و لاپەرەی و سالی لەچاپدانی و ناوی چاپخانەی تیدا لەچاپ دراوەو ژمارەی چاپی لە داوینی وتاردا ـ بکەن.

۲ ـ لە هەر کوی یەکی وتاردا پەراویز پیویست بی پەراویزی بۆ بنووسن.

۳ ـ پوختەیەکی وتارەکە بە عەرەبی لەگەل بنیرن.

٤ ـ بەهۆی بارودۆخی ئابووریی ئیستاو گەمارۆی نارەواوە هەول بدەن تا پیتان ئەکری وتارەکانتان پوخت و کورت بن بۆئەوەی لاپەرەکانی گۆڤارەکە جیگای زۆرترین ژمارەی وتارە بەسوودەکانتانی تیدا ببیتەوە.

٥ ـ نووسەر کورتەیەکی ژیان نامەی و پلەی زانستی و کارەکانی پیشتری و ناوی بەرهەمەکانی و لەکوی و لەچیدا لەچاپ دروان و، وینەیەکی خۆی لەگەل وتارەکەیە بنیری.

سوپاستان ئەکەین.

دەستەی راویژکاری
گۆڤاری «رۆشنبیری نوی»

# هەولێر نەك بەغدا یەکەم شاری عیراق بوولە بوواری مانگرتندا بۆ داشکاندنی نرخی کارەبا



کەمال مەزهەر

پێشکەشە بە یادی براو هاورێم، ڕۆڵەی بەوەفای هەولێر خوالێخۆشبوو دوکتۆر ڕەشید قۆجە قەصاب.

*************************

بە هۆی ئینگلیزو ئەڵەمانەوە سەرەتای ئەم سەدەیە نوری کارەبا گەیشتە عیراق. دوای داگیرکردنی عیراق لە لایەن لەشکری ئینگلیزەوە خەڵکی پتر لە نیعمەتی کارەبا تێگەیشتن و زۆرتر ڕوویان تێ کرد، سەرباری ئەوە بەرژەوەندە تایبەتی بەکانی ئینگلیز خۆیشیان پێویستیان بەوە بوو بایەخ بدەن بە بەکارهێنانی کارەبا. بەر لە کۆتایی بیستەکان یەك لە دوای یەك کارەبا گەیشتە شارەکانی کوردستانی عیراقیش. شایانی باسە تا سەرەتای سیەکان ٢٧٩ ماڵ و دوکان و دەزگا لە کەرکوك و ٣٣٠یش لە سلێمانی کارەبایان وەرگرتبوو. بەغداو بەسرەو موسڵ پێش ئەوان بە ماوەیەك کارەبایان بۆ هات.

بەر لە کۆتایی بیستەکان ئەحمەد محەمەد چەلەبی دەباغ، کە لە بنەماڵەیەکی ناسراوی هەولێرە، داوای مافی دامەزراندنی مەکینەی کارەبای کرد بۆ ناوشار. ئەنجومەنی شارەوانی و موتەصەریف (پارێزگار)ی هەولێرو وەزارەتی کاروباری ناوخۆ بەگەرمی پشتیگری ی داواکەیان کرد. بەپێی تەقدیری ئەحمەد چەلەبی خۆی هێنان و دامەزراندنی مەکینەکەو ئەو خانووەی بۆی تەرخان کرا بەسەر یەکەوە دەوروبەری صەدو پەنجا هەزار ڕوپی، واتا نزیکەی یازدە هەزارو دووصەدو پەنجا دیناری تێچوو کە بۆ ڕۆژگاری خۆی پارەیەکی یەکجار زۆر بوو. دوور نی یە تەقدیرەکەی ئەحمەد چەلەبی زۆر دروست نەبێت، چونکە مەکینەی کارەباکەی سلێمانی کە شارەوانی بۆ خۆی هەر ئەو دەوروبەرە دایمەزراندبوو تەنها حەفتا هەزار ڕوپی تێچوبوو. هەر چۆن بێت ئەحمەد چەلەبیش کەمی خەرج نەکردبوو، تەنانەت ڕۆستەم چەلەبی، کە ئەویش لە ناودارانی هەولێرە (مامی عوسمان و موحسین و نەجم و دوکتۆر ڕەشید قۆجە قەصابە) سەرەتا دەیویست بێتە هاوبەشی ئەحمەد چەلەبی، بەڵام دوایی لەبەر زۆری سەرمایەی پرۆژەکە، کەوا دیارە لە وێزەی ئەودا نەبووە، پەشیمان بۆتەوە[1].

ئیمتیازەکەی ئەحمەد چەلەبی لە سێ مەرجی سەرەکی پێکهاتبوو:

یەکەم - دەربارەی ماوەی خودی ئیمتیازەکە بوو کە بڕیار درا سێ ساڵ بێت.



وێنەی حاجی شەریفی دۆغرەمەچی لەگەڵ دوکتور هاشمی کوریدا.

دووەم - دەبوو ئەحمەد چەلەبی بەرانبەر مانگانەی ٦٠٠ ڕوپی بە گڵۆپ شەقامەکانی ناو شار ڕووناك بکاتەوە.

سێیەم - نرخی هەر کیلۆواتێکی کارەبا بۆ خەڵکی ناو شار لە دە عانە تێنەپەڕێت[2].

بەو جۆرە پرۆژەی کارەبای ناو شاری هەولێر دامەزراو ڕۆژی هەشتی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٣٠ لە خوار دەرگای قەڵاتی، بەر لە

مزگەوتی حاجی قادری دەباغ بووە ڕۆژی حەشر، عەشاماتێکی زۆر ڕژانە ئەوێ، هەموو حەپەسا بوون، زۆری نەبرد ئاشی ئەلەکتریکی شار کەوتە کارو گڵۆپ داگیرسا.

یەکەم ڕۆژ کارەبای هەولێر گەیشتە ئەم چوار ماڵە: عەبدولحەمید بەگی پارێزگارو دەروێش لوطفی بەگی بەڕێوەبەری پۆلیس و یونس ئەفەندی ئەفسەری پۆلیس و زیا ئەدهەم کە خاوەن ئاش بوو، جگە لە قوتابخانەی شوعبەو شەش چایخانە کە ئەمانە خاوەنیان بوون ـ حاجی وەلی قادرو فەتاح سالح و عومەر مەلاو عومەر ڕەشیدو جەمیل قاوەچی و عەبود سەلمان. تا ناوەندی ساڵی ١٩٣١، واتا لە ماوەی دەوروبەری دە مانگدا، ئەو دوکان و ماڵ و دەزگایانەی شاری هەولێر کە کارەبایان ڕاکێشا ژمارەیان گەیشتە ١٢٥، لەوانە، بە وێنە، حاجی ڕەشید ئاغای وەیس کە پاش پێنج ڕۆژ لە دەستبەکارکردنی ئاشی ئەلکتریکەکە کارەبای ڕاکێشایە ماڵی خۆی، شەهاب چەلەبیش ڕۆژی شازدەی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٣٠ ماڵەکەی کردە چراخان، هەر ئەو ڕۆژەش یانەی فەرمانبەران هەولێرو ماڵی زەکی ئەمین ئەفەندی ی بەڕێوەبەری قوتابخانەی ناوەندی ی شار کارەبایان وەرگرت. هەرچی حاجی شەریف خەلیل دۆغرەمەچی یە، کە باوکی دوکتۆر هاشم دۆغرەمەچی و ئەندازیار محەممەد دۆغرەمەچی یەو ناوی چەند جارێك لەم وتارەدا دووپات دەبێتەوە، ڕۆژی بیستوحەوتی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٣٠ کارەبائی ڕاکێشاوەتە ماڵی خۆی. یەکێکی وەك داود ئاغای سەعید ئاغا دوو هێڵی ڕاکێشاوە، یەکەمیان ڕۆژی دوازدەی شوباتی ساڵی ١٩٣١ بۆ محەلەکەی و دووەمیشیان پاش سێ ڕۆژ بۆ ماڵەوەی. لەو ڕۆژانەدا ڕەفیق حیلمی مامۆستای ناوەندی دەبێت لە هەولێر، ئەویش ڕۆژی یەکی تەموزی هەمان ساڵ کارەبا وەردەگرێت[٣].

هەڵبەت دامەزراندنی ئاشی ئەلەکتریك لە گشت ڕوویەکەوە هەنگاوێکی ژیاری ی گەورەبوو بۆ ژیانی هەولێرو هەولێری یەکان، بەڵام ئەوساکە نرخی کارەبا بەنیسبەت کەمدەرامەتی ی خەڵکی یەوە زۆر بەرزبوو، کیلۆواتێکی لە هەولێر بە دە عانە، واتا بە چل فلس بوو، کەچی لە بەغدا کە کارەباکەی بەدەست کۆمپانیایەکی ئینگلیزییەوە بوو نرخی حەوت عانە، واتا بیستو هەشت فلس بوو. لە سلێمانی سەرەتا، واتا کۆتایی بیستەکان، نرخی کیلۆواتێك دوازدە عانە (چلو هەشت فلس) بوو، بەڵام زۆری نەبرد کە نرخی کرایە هەشت عانە (سیو دوو فلس). بێ گومان ئەوە یەکێك بوو لەو هۆیانەی ژمارەی ئەوانەی لە هەولێر کارەبایان وەرگرت نەدەگەیشتە نیوەی ئەوانەی لە کەرکوك، یا لە سلێمانی کارەبایان وەرگرتبوو.

هەرچۆن بێت لە هەموو لا خەڵکی نرخی کارەبایان پێ بەرز بوو. لە بەغدا ئەو نارەزاییە سەرئەنجام بووە هۆی تەقینەوەی مانگرتنێکی بەرفراوان کە ڕۆژی پێنجی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٣٣ دەستی پێ کردو بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك کەس نە لە ناو ماڵدا، نە لە دوکان و کارگەکاندا کارەبای بەکار نەدەهێنا تا میری بە زەبری کوتەك ئەو بزوتنەوەیەی دانەمرکاندەوەو ڕابەرانی بۆ شاری سلێمانی دوورنەخستەوە[٤].

ئەو مانگرتنەی بەغدا لاپەڕەیەکی بایەخدارە لە مێژووی هاوچەرخی عیراقداو تا ئێستا بە ڕوداوێکی تاقانەو بێ هاوتا لە ناو تۆماری ئەو مێژووەدا لەقەڵەم دراوە، کەچی لە ڕاستیدا، بەپێی بەڵگەنامە بڵاونەکراوەکانی خودی وەزارەتی کاروباری ناوخۆی عیراق، بەر لەوە بە نزیکەی دوو ساڵ و نیو لە هەولێر مانگرتنێکی لەو جۆرە سازکراوە کە دەبێت پایەو مەقامی یەکەمی پێ بدرێت لە ناو لاپەڕەکانی ئەو تۆمارەدا.

لە سەرەتای ساڵی ١٩٣١وە هەولێری یەکان لەناو خۆیاندا کەوتنە مقۆ مقۆو توانج تێگرتن لەسەر نرخی کارەبا، تایبەت لەو ڕۆژانەشدا گرانی بەجارێك باڵی بەسەر دونیادا کێشابوو. تا ناوەندی ئەو ساڵە نارەزایی هەولێری یەکان لەم بووارەدا گەیشتە ئاستی بزوتنەوەیەکی ڕێکخراو کە نوێنەرانی گشت دەستەوچینەکانی ناو شارتێیدا بەشدار بوون، چونکە کەم کردنەوەی نرخی کارەبا سەرئەنجام لەگەڵ بەرژەوەندی ئەو ڕەشوڕوتانەشدا دەگونجا کە هێشتا لەناو ماڵدا قوتیلەو فانۆسیان بەکاردەهێنا نەك کارەبا. بەڵام بەرانبەر بەوان هی واش هەبوون دەیانویست بۆ خۆیان جێگەی ئەحمد چەلەبی دەباغ بگرنەوە، یان هەر ناحەزی ئەو بنەماڵەیە بوون بۆیەکا بە گەرمی تێکەڵی بزوتنەوەکە بوبون.

لە ناوەندی مانگی شوباتی ساڵی ١٩٣١وە ژمارەیەك کاسبکاری هەولێری دەستیان لە بەکارهێنانی کارەبا هەڵگرت. یەکەم کەس لەم بووارەدا محەممەد ئەحمەدی چاپچی بوو کە لە ڕۆژی پازدەی ئەو مانگەوە کارەبای لە چایخانەکەی خۆی بڕی. پاش نزیکەی دوو حەفتە وەستا ئاکۆپی پێڵاودروو وەستاخەلیلی سەعاتچی و سەرداود محەمەدی چاپچی و جوبرائیل ناوێك لاساییان کردەوە، ئەوانیش پێکڕا کارەبایان لە دوکانەکانی خۆیان بڕی[٥].

تا دەهات ئەو بزوتنەوەیە پتر پەرەی دەسەند. پارێزگاری هەولێر بۆ یەکەم جار لەو نامە نهێنی یەیدا کە ڕۆژی بیستی تەموزی ساڵی ١٩٣١ ناردوویە بۆ وەزیری کاروباری ناوخۆ باسی ئەوەی کردووە چۆن دوازدە بیست کەسێك لە کاسبکاران مانگرتنێکیان ساز کردووە[٦]. لە ڕۆژی چواری ئابەوە ئەو بزوتنەوەیە دەبێتە مانگرتنێکی گشتی بەوەی پەنجاو سێ کەس بەجارێك کارەبا لە ماڵ و دوکان و چایخانەکانی خۆیان دەبڕن. مانگرتنەکە بە کاسبکارانی ناوبازارەوە نەوەستا، بەڵکو هەمان کات ژمارەیەك لە گەورە پیاوان و ڕووناکبیرانی شار بەشدارییان تێداکرد، لەوانە مامۆستا ڕەفیق حیلمی و بەڕێوەبەری قوتابخانەی ناوەندی زەکی ئەمین و محەممەد دۆغرەمەچی و داود ئاغای سەعید ئاغا، جگە لە مامۆستایانی قوتابخانەکان ژمارەیەك لە فەرمانبەرانیش بەشداری ی مانگرتنەکەیان کرد، کەمال ئەفەندی پشکنەری پۆست و تەلەفونی شاریەکێك لەو فەرمانبەرانە بوو، ئەویش لە ڕۆژی دەی

ئەموزی ساڵی ۱۹۳۱وە کارەبای لە ماڵی خۆی بڕی. مەلا ئەفەندیش لایەنگر بوو، تایبەت چونکە دانوی لەگەڵ عەبدولحەمید بەگی پاریزگارو جەمال ڕەفعەتی مودیری تەحریراتدا نەدەکولا، ئەو کارەبای ڕانەکیشابوو بەڵام موحسین ئاغای خوشکەزای، کە بەڕیوەبەری شارەوانی بوو، لە ڕۆژی چواری ئابەوە بەشداری ی لە مانگرتنەکەدا کرد. بەپێی گێڕانەوەی بەڵگەنامەکان مەلا ئەفەندی زۆر جاران لە باداواوە ئۆتۆمبیلی تایبەتی ی خۆی دەنارد بەدووی ڕابەرانی مانگرتنەکەدا. دوایی جەعفەر ئەبولتمەنیش لە بەغدا بە هەمان دەستوور پێوەندی ی هەبوو بە ڕابەرانی مانگرانی بەغداوەو ئەویش یەکێك بوو کە هەر لە سەرەتاوە کارەبای لە ماڵی خۆی بڕی.

شایانی باسە مانگرانی هەولێر، تایبەت چایچی یەکانی ناوشار، بڕیاریان دا لە ڕۆژانی مانگرتنەکەدا گرامافۆنیش بەکار نەهێنن، ویستیان لەو ڕیگەیەوە پتر سەرنجی هەموو لا بەلای بزوتنەوەکەیاندا ڕابکێشن. بەو جۆرە ناوبازار خامۆش بوو، دوای ئەوەی جاران لە هەرچوارلاوە، تا درەنگە شەوانێ دەنگی قەوان ناڵەی دەهات.

تا ئەو دەوروبەرە دروشمی مانگرانیش قاڵبی تەواوی خۆی لە سێ خاڵی سەرەکیدا وەرگرت، کە ئەمەی لای خوارەوە پوختەیانە:

۱ ـ داشکاندنی نرخی هەر کیلۆواتێکی کارەبا لە دە عانەوە بۆ چوارعانە، یا هیچ نەبێت بۆ شەش عانە، واتا لە چل فلسەوە بۆ ۱٦، یا ئەوپەڕەکەی بۆ ۲٤ فلس.

۲ ـ ئەگەر ئەو داخوازییە جێ بەجێ نەکرا ئەوساکە شارەوانی بۆ خۆی مەکینەی کارەبا بهێنێت، یا ڕیگە بدات خەڵکەکە بۆ خۆیان مەکینە بهێنن، یا هەردوو لا بە هاوبەش.

۳ ـ گواستنەوەی مودیری تەحریرات جەمال ڕەفعەت(۷) کە بە چاوساغ و لایەنگری ئەحمەد چەلەبی دەباغیان دادەنا.

ناوەندی ئابی ۱۹۳۱، واتا لە گەرمەی ڕۆژانی مانگرتنەکەدا، نوری سەعیدی سەرەك وەزیران هاتە سەرداز هەولێر، ڕابەرانی مانگرتنەکە ئەوەیان بە هەل زانی و ڕۆژی پازدەی ئاب سکاڵانامەیەکی، دووروودرێژیان بۆی ئامادە کردو بۆ ڕۆژی داهاتوو دەستەیەکی هەڵبژاردە سکاڵانامەکەیان پێشکەش بە نوری پاشا کرد. سکاڵانامەکە ناوی ٤٤٨ کەسی بەسەرەوەیە، ۳۸۰کەسیان مۆرو ٦۸یشیان ئیمزایان کردووە. بەشێك لە ئیمزاکان هی دیان و جووەکانی شارن. ناوەرۆکی سکاڵانامەکە خۆیشی بریتی یە هەر لەو سێ داخوازییەی لە سەرەوە باسیانمان کرد(۸).

ئەم هەوڵوکۆششەی هەولێری یەکان هیچی لێ سەوز نەبوو، تایبەت لەبەر ئەوەی عەبدولحەمید بەگی پاریزگار بە توندی دژی مانگرتنەکە وەستاو لە هەموو ڕوویەکەوە لایەنی جەمال ڕەفعەت و ئەحمەد چەلەبی دەباغی دەگرت. لەوەیش بەولاوە ئینگلیزەکان بایەخیکی زۆریان بەو مانگرتنەی هەولێر دا، دەقی سەرجەمی سکاڵانامەو داخوازیکانی مانگرەکانیان کردە ئینگلیزی و بەوردی لێیان کۆڵینەوە. تەنها ئەو ڕاپۆرتە نهێنی یەی میستەر لاینی پشکنەری کارگێری کەرکوك و هەولێر ڕۆژی سێی تەشرینی یەکەمی ساڵی ۱۹۳۱ دەربارەی مانگرتنەکەی هەولێر ناردوویە بۆ ئەدمۆندسی ڕاوێژکاری وەزارەتی کاروباری ناوخۆ لە بەغدا بریتی یە لە هەشت لاپەڕەی قەوارە گەورە(۹) ئینگلیزەکان پێیان وانەبوو ئەو جۆرە بزوتنەوەیە بۆ شاریکی وەك هەولێر هەروا کاریکی ئاسایی یە. لە ڕاپۆرتێکی نهێنی خۆیاندا لە مانگی ئابی ساڵی ۱۹۳۱دا


الی صاحب المعالی وزیر الداخلیة المحترم

١٩٦٩٥

٢١/٩/١

وێنەی سکاڵانامەی مانگرانی هەولێر بۆ وەزیری کاروباری ناوخۆ.

لەو بارەیەوە نووسیویانە دەڵێن:

«داخوازییەکی لەو بابەتە (واتا داوای داشکاندنی نرخی کارەبا لە ڕیگەی مانگرتنەوە) بە گشتی دیاردەیەکی نائاسایی یە بۆ شوێنێکی وەك

هەولێرو نیشانەی ئەوەیە کە جۆرە بزوتنەوەیەکی ڕێکخراوی گێرمشێوێن لە ئارادایە»[10]. ئەم تێبینی یە بۆ ڕۆژگاری خۆی بایەخی تایبەتی ی هەیە، ڕەنگێ بەنیسبەت هەولێرەوە یەکەم ئاماژەی لەو بابەتە بێت بۆ سەرهەڵدانی بزوتنەوەی سیاسی ی ڕێکخراو بە نهێنی.

مانگرانیش دەستیان هەڵنەگرت، ئەمجاریان ڕۆژی بیستوحەوتی ئاب دوو سکاڵانامەی تریان ناردە بەغدا، یەکێکیان دیسانەوە بۆ نوری سەعیدی سەرەك وەزیران، ئەوی تریشیان بۆ موزاحیم پاچەچی وەزیری کاروباری ناوخۆ، سکاڵانامەی ئەمجاریان ئیمزاو مۆری ٥٠٥ کەسی پێوەیە، واتا ٥٧ کەس پتر لەوانەی سکاڵانامەی یەکەمیان دایە نوری سەعید لە هەولێر. ئەمە خۆی لە خۆیدا بەڵگەی سووربوونی کاسبکارانی هەولێرە لەسەر داخوازییەکانیان. وا دیارە ڕابەرانی مانگرتنەکە ئەمجاریان وێنەی هەردوو سکاڵانامەکەیان داوەتە ڕۆژنامەکانی بەغداش، چونکە ڕۆژنامەی «العراق» دوو جاران لەو ڕۆژانەدا بە تایبەتی باسی سکاڵانامەی دانیشتوانی هەولێری کردووە[11].

هەردوو سکاڵانامەکە بە خەتێکی جوان و ڕێکوپێك نووسراونەتەوە، لە ڕووی ناوەرۆکەوە هێمن و لەسەرخۆن، عەرەبی یەکەشیان هەرچەندە بێ هەڵە نی یە، بەڵام بە گشتی مستەواکەی باشە. پوولێك وا بە دامێنی هەر یەکێکیانەوە کە نرخی یەك ڕوپی، واتا ٧٥ فلسە، هەردوو پوولەکەش مۆری حاجی شەریفی دۆغرەمەچی یان بەسەرەوەیە کە دیارە لە ناو مانگرەکاندا پایەو مەقامی تایبەتی ی خۆی هەبووە، بە بەڵگەنامە نهێنی یەکاندا وا دیارە دەمڕاستی مانگرەکان و ڕابەری بزوتنەوەکەیان بووە، یەکێك لە بەڵگەنامەکان بە «سەرۆکی کۆمەڵەی عەتتاران» ناوی هێناوە. حاجی شەریف بۆ ڕۆژگاری خۆی پیاوێکی دونیادیدەو وریاو لەناو خەڵکدا ڕێزدار بووە، ئاگادارانی هەولێر دەڵێن «عاشقی عەدالەت بووە»[12]. بە پێی بەڵگەنامەکان لە ڕۆژانی مانگرتنەکەدا کاسبکارانی شار بە سەرپەرشتی حاجی شەریف زوو زوو بە ڕۆژ کۆبوونەوەی تایبەتی یان لە چایخانەکەی عەبو سازدەکرد، شەوانیش بۆ هەمان مەبەست دەچوونە قەراغ شار. لێرەدا ناوی کەریم گورجیش هاتووە.

بەپێی ئەو نامەیەی پارێزگاری هەولێر ڕۆژی ٢٦ی ئابی ساڵی ١٩٣١ ناردوویە بۆ وەزارەتی کاروباری ناوخۆ جگە لە حاجی شەریفی دۆغرەمەچی ئەم چوار کەسەش هاندەری مانگرتنەکە بوون:

١- مەلا ئەمینی بەقاڵ.

٢- یاسینی حاجی ئەلیاسی بەزاز.

٣- حاجی یونسی ئاسنگەر.

٤- حاجی محەمەد قەرۆکی ئاسنگەر[13].

زۆربەی هەرە زۆری ئەوانەی دوو سکاڵانامە تازەکەیان مۆر، یا ئیمزاکردووە بریتین لە عەتتارو بەقاڵ و بەزازو ئاسنگەرو سەرتاش و دارتاش و چایخانەچی و خەفاف و قەصاب و چێشتخانەچی و دوکاندارو کاسبکاری تر، بەڵام، هەمان کات، ژمارەیەك لەوانەش کە پێ یان دەگوتن پیاوماقوڵ و ئەفەندی داویانەتە پاڵیان و هەردووك سکاڵانامەکەیان ئیمزاکردووە، وەك حاجی عومەر مستەفاو ساڵحی سۆفی بەگە و محەمەدو وەهابی شێخۆو نادر عەبدولقادری باوکی فایق و دوکتۆر نامیق و دوکتۆر تەحسین و پارێزەر طەلعەت نادر.

نوری سەعید هیچی نەکرد لەوە بەولاوە کە داوای لە پارێزگاری موسڵ کرد جەلال بابان بنێرێت بۆ هەولێر بۆ توێژینەوەی سەرجەمی



هۆرەکانی سەرسکاڵانامەکە

کێشەکە، وا پێ دەچێت نوری سەعید ویستبێتی ئەو کارە ڕاسپێرێتە فەرمانبەرێکی لێهاتووی کورد، بۆیەکا لەناو هەمواندا جەلال بابانی پێشنیارکردووە کە ئەوساکە پشکنەری کارگێری (مفتش إداري) موسڵ بووە. بەڵام سەرئەنجام کارەکە خرایە ئەستۆی پشکنەری کارگێری هەولێرو کەرکوك کە ئەوساکە میتەر لاین بوو، لاین لە کەرکوك

دادەنیشت و جاروبار سەری هەولێری دەدا(١٤).

هەڵوێستی وەزیری کاروباری ناوخۆ بە جۆرێکی تر بوو. ئەوساکە، وەك وتمان، موزاحیم پاچەچی وەزیری کاروباری ناوخۆ بوو، پاچەچی سیاسەتمەدارێکی هەلپەرست و توندڕەو بوو. بەر لەوەی ببێتە وەزیری کاروباری ناوخۆ یەکێك بوو لە ڕابەرە ناسراوەکانی «پارتی نیشتمانی» (الحزب الوطني) کە نیشتمانپەروەری گەورە جەعفەر ئەبولتەمەن سەرۆکی بوو، پاچەچی لە هەموان ڕەقتر دژی بەستنی پەیمانی ساڵی ١٩٣٠ی نێوان عێراق و بەریتانیا وەستا، بەڵام نوری سەعید کە چاك لە دیوی ناوەوەی ئەو جۆرە کەسانە تێدەگەیشت بە ئاسانی بەلای خۆیدا ڕایکێشا بەوەی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٣١ کردییە وەزیری کاروباری ناوخۆ.

هەڵبەت سیاسەتمەدارێکی وا هەلپەرست «دڵسۆزی ی» خۆی لە ئاستی گەل و نیشتماندا بە کورد تاقی دەکاتەوە. پاچەچی چەند جارێك دەستی لە کورد وەشاندووە، تایبەت ساڵی ١٩٤٥ کە سەرەك وەزیران بوو، لەو ساڵەدا بڕیاری خنکاندنی ئەفسەرانی کورد عیزەت عەبدولعەزیزو مستەفا خۆشناوو خەیری عەبدولکەریم و محەمەد قودسی دەرچوو. لەبەر ئەوە سەیر نی یە پاچەچی ویستی دەستوبرد کۆتایی بە مانگرتنەکەی هەولێر بهێنێت، هەرچەندە هەولێری یەکان لە خودی ئەو سکاڵانامەیەشدا کە دابوویانە ئەو چەند جارێك زۆر بە نەرمونیانی باسی دڵسۆزیی خۆیانیان بۆ میری تۆمارکردبوو. لەگەڵ ئەوەش پاچەچی بە نامەیەکی نهێنی داوای لە پارێزگاری هەولێرکرد بە ڕەقی ڕەفتاری مانگرانی ئەو شارەبکات. ئەمەش دەقی نامەکەیەتی:

«بۆ پارێزگاری هەولێر، نهێنی

ژمارە: س/ ٢٦٨٧

ڕۆژ: ٣١ی ئابی ١٩٣١

نیشانە بە نامەی ژمارە ١٣٢ی ڕۆژی ٢٦ی ئابی ١٩٣١تان. ئێمە گشت تێبینی یەکانتانمان ڕەچاوکردو پێتان ڕادەگەیێنین کە چاو لە هیچ جۆرە بزوتنەوەیەك، یان هەنگاوێك ناپۆشین ببێتە هۆی جۆرە بزوتنەوەیەك، یان لاوازکردنی دەسەڵاتی میری، تکامان وایە بایەخی تەواو بدەن بەم لایەنە. ئیمزا: وەزیری کاروباری ناوخۆ»(١٥).

لەبەر ڕۆشنایی ناوەرۆکی ئەم نامەیەدا کاربەدەستانی هەولێر کەوتنە خۆ، فشارێکی زۆریان خستە سەر مانگرانی شارو دەستیان کردە ئامادەکردنی سکاڵانامەی ساختە دژیان و بۆ پشتگیری کردن لە جەمال ڕەفعەت، پۆلیس نزیکەی دە کەسیشیان ڕاپێچ کرد بۆ تەحقیق لەگەڵیاندا. لەگەڵ ئەوەش بێنەوبەرەی ئەو کێشەیە تا ئەوروبەری کۆتایی ساڵی ١٩٣١ درێژەی کێشاو تا دەهات ئاڵۆزتردەبوو. مانگران سووربوون لەسەر داواکانیان، ڕۆژی نوی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٣١ دوو بروسکەی تریان نارده بەغدا، یەکەمیان بۆ نوری سەعیدو دووەمیان بۆ موزاحیم پاچەچی، ئەمجاریان بروسکەکانیان لە کەرکوکەوە نارد نەك لە هەولێرەوە، وا دیارە ترسی ئەوەیان هەبووە نەبا بروسکەکان لە هەولێرەوە نەگەنە شوێنی مەبەست. هەردوو بروسکەکە بەم ناوانەوە لێدراون: لە بریتی دەستە (صنفی) قەنارچی مەلامحەممەد، لە بریتی دەستەی خەفافەکان مەلاخضر، لە بریتی دەستەی بەرگدرووان حاجی عەلی، لە بریتی دەستەی عەتتارەکان حاجی شەریفی دۆغرەمەچی، لە بریتی دەستەی گۆزەچی یەکان صوفی ئیسماعیل، لە بریتی دەستەی سەرتاشەکان عەبدولوەهاب، لە بریتی دەستەی زینلدرووەکان عومەر دای، لە بریتی دەستەی کوڵەلگران (حەماڵەکان) عیززەدین، لە بریتی دەستەی ئاسنگەران حاجی یونس، لە بریتی دەستەی مزگەران حاجی کەریم، لە بریتی دەستەی نالبەندان عەبدوڵلا، لە بریتی دەستەی دەلالان محەممەد فارس، لە بریتی دەستەی قەصاب داود ئاغا، لە بریتی دەستەی لبادکەران شێخ یونس، لە بریتی دەستەی دارتاشان فیض الله، لە بریتی دەستەی نانەوایان محەممەد صالح، لە بریتی جووەکان صالح یوسف نوری.

ئەمانە لە بروسکەکەیاندا دوو تەقەلا بێ سوودەکەیان وەبیرسەرەك وەزیران و وەزیری کاروباری ناوخۆ هێناوەتەوەو بە ناوی «سەرجەمی کاسبکاران و کرێکارانی هەولێرەوە» داوایان لێ کردوون عەدالەت فەرامۆش نەکەن و داخوازییەکانیان جێ بەجێ بکەن و ڕادەیەك بۆ فشارو دەستدرێژی کاربەدەستانی میری دابنێن.

دیسانەوە نوری سەعید هیچی نەکرد لەوە بەولاوە کە ئەویش دەقی بروسکەکەی لەگەڵ نامەیەکی تایبەتیدا نارد بۆ وەزارەتی کاروباری ناوخۆ، تەنانەت نامەکەیش ئیمزای سکرتێری ئەنجومەنی وەزیرانی بەسەرەوەیە نەك ئیمزای نوری پاشا خۆی(١٦).

بەڵام هەر لەو ڕۆژانەداو لەبەر هەر هۆیەك بێت نارەزایی گەیشتە دەشتودەری هەولێریش، ڕۆژی یازدەی تەشرینی دووەم، واتا تەنها دوو ڕۆژ دوای بروسکەکانی کاسبکارانی شار، ئەم سەرەك هۆزانەش، دژی پارێزگاری هەولێر، بروسکەیەکی تایبەتی یان ئاراستەی نوری سەعیدکرد: سەرۆکی میر یوسفی خۆشناو صالح بەگی میران و سەرۆکی گەردی جەمیل ئاغاو سەرۆکی کۆڕی مەجید ئاغاو سەرۆکی میر مەحمەلی ی خۆشناو قادر بەگی میران، جگە لە ئاغایانی دزەیی خورشیدی بایز ئاغاو حسەین ئاغای مەلاو سلێمان ئۆمەر ئاغاو ڕەسوڵ محەممەد صادق ئاغا.

سەرئەنجام میری ناچار بوو لە کەلی شەیتان بێتە خوارێ و جەمال ڕەفعەت لە هەولێر ڕاگوێزێت و ئەحمەد چەلەبی دەباغیش ناچار بکات دوو عانە لە نرخی هەر کیلۆواتێکی کارەباکەی دابشکێنێت. بەو جۆرە مانگرتنەکەی هەولێر کۆتایی هات، ئەو مانگرتنەی لە هەموو ڕوویەکەوە هیچی لە مانگرتنە بەناوبانگەکەی بەغدا کەمتر نی یە، بەڵکو لەبەر سێ هۆی بایەخدار تەرازووی مێژوو بەلای ئەودا دەشکێتەوە، یەکەمیان دەستپێشکەری کردنی هەولێری یەکانە لەو بووارەدا، دووەمیشیان کۆڵنەدانی مانگرانی هەولێرە لە ماوەی شەش مانگی ڕەبەقدا، لەگەڵ وەدی هێنانی بەشێك لە داواکانیان، بەرانبەر دامرکاندنەوەی

کوپڕی مانگرتنەکەی بەغدا کە لە ڕاستیدا هیچی ئەوتۆی لێ سەوز نەبوو، ئەو مانگرتنەی هەر لە سەرەتاوە ڕۆژنامەکانی بەغدا ناویان لێ نا «ڕۆژی شانازی نیشتمانی»(١٧).

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە چاو لەوە نەپۆشین کە لەو ڕۆژانەدا هەندێك دەست لە ژێرەوە، بۆ بەرژەوەندی خۆیان، کنەیان دەکرد، جەمال ڕەفعەتیش کارگێڕێکی دەست خاوێن و لێهاتوو بوو، بەڵام زۆر بەخۆی دەنازی، ئەحمەد چەلەبی دەباغیش خزمەتێکی گەورەی هەولێری کرد بەوەی مەکینەی کارەبای بۆ هێنا، بەڵام ئەویش دەبوو باری سەختی ڕەشوڕووتی هەولێر فەرامۆش نەکات، هەرچەندە بەپێی دەفتەری تایبەتی ی خۆی پڕۆژەکەی زەرەری دەکرد نەك قازانج، بەڵام وا پێ دەچێت وانەبوبێت، چونکە کە نوری سەعید هاتە هەولێر بە گەرمی داوای لێ کرد ماوەی ئیمتیازەکەی لە ٣ ساڵەوە بۆ بکەنە ٢٥ ساڵ، بە پێی یاسای نەگۆڕی ئابووریش هەر پڕۆژەیەك زیان بکات دادەخرێت نەك بەپەرۆشەوە کۆشش دەکرێت بۆ درێژەپێدانی بەو ڕادەیە.

هەرچۆن بێت مانگرتنی کاسبکارانی هەولێر لە ساڵی ١٩٣١دا لاپەرەیەکی بایەخداری وێ مێژووی هاوچەرخی کوردو عیراقە.

## پەراوێزەکان:

(١) ملفات وزارة الداخلية (م. و. د.)، مديرية المخابرات السرية السياسية ١٩٣١، رقم الملف: ٢٧/ أربيل/ ٢، العنوان: السياسة [illegible]. موضوع الملف: الحركات السياسية في لواء أربيل، **Office of the Administratrive inspector, Arbil and Kirkuk, Confidential, No. C/ 389, 3rd October 1931, to the Adviser, Ministry of Interior, Baghdad, PP. 1. 6**

**(2) Ibid, PP. 1 - 2**

**(3) Ibid, List of Electric Consumers Past and Present, PP. 1 - 2.**

(٤) بۆ باسی ئەو مانگرتنە بڕوانە: عبدالرزاق الحسني، تأريخ الوزارات العراقية، الطبعة السابعة، دار الشؤون الثقافية العامة، الجزء الرابع، بغداد، ١٩٨٨، ص١٠ ـ ١٢.

**(5) List of Electric Consumers..., PP. 1 - 2.**

(٦) م. و. د.، الملف السابق، ص٦.

(٧) ڕەفعەت ئەفەندی باوکیشی لە شارەوانی هەولێر فەرمانبەر بوو، دەڵێن بە ئەسڵ حەڵەبین، هەردووکیان لێهاتوو بوون.

(٨) م. و. د.، الملف السابق، من متصرفية لواء أربيل الى وزارة الداخلية ببغداد، الرقم ١٣٢/ س/ سري، التأريخ ٢٦ آب ١٩٣١، الموضوع: تقديم صورة مضبطة، ص٤ ـ ٦.

**(9) Ibid, Office of the Adm. Insp., Arbil and Kirkuk, Confidential, No. C/ 389, 3rd Oct. 1931, PP. 1 - 8.**

**(10) Ibil, P . 3, Extract from Confidential Report on the Arbil and Kirkuk Liwas for the month of August, 1931, Arbil Town.**

(١١) «العراق» (جريدة)، بغداد، ١و٨ أيلول ١٩٣١.

(١٢) دیدەنی لەگەڵ دادوەر فەتاح مەحمود حاجی عەبدوڕەحمان ئاغا، ڕۆژی دوازدەی مایسی ١٩٩٨.

(١٣) م. و. د.، نفس الملف السابق، من متصرفية لواء أربيل الى وزارة الداخلية ببغداد، الرقم ١٣٢/ س/ سري، التأريخ ٢٦ آب ١٩٣١، الموضوع: تقديم صورة مضبطة، ص٦.

(١٤) الملف نفسه، ص١٠.

(١٥) الملف نفسه، ص٧.

(١٦) الملف نفسه، ص٢٥ ـ ٢٦، ديوان مجلس الوزراء، بغداد، الرقم ٤١٢٨، التأريخ ٩ تشرين الثاني ١٩٣١.

(١٧) بۆ نمونە بڕوانە: «العالم العربي» (جريدة)، بغداد، العدد ٢٩٨٦، ٢ كانون الاول ١٩٣٣.

## ملخص البحث:

# اربيل وليست بغداد اول مدينة في مضمار إضراب مقاطعة الكهرباء

**كمال مظهر**

يدور محور البحث حول إضراب مقاطعة الكهرباء في مدينة أربيل، الذي وقع في أواسط العام ١٩٣١، واستمرت افرازاته على مدى أشهر، ليسبق بذلك إضراب مقاطعة الكهرباء في بغداد بحوالي سنتين ونصف السنة، مما يضفي عليه بعدا تأريخيا خاصا تجاوز في مداه السبق الزمني المجرد ليشمل كذلك النتائج التي تمخضت عن الاضرابين، فان الاول منهما يفوق الثاني في هذا المضمار أيضا، مع وجود نقاط التقاء كثيرة بين الحالتين، منها، على سبيل المثال، دور الشخصيتين البارزتين ملا أفندي في إضراب أربيل، وجعفر ابو التمن في إضراب بغداد.

ينطوي البحث، فضلا عن ذلك، على مجموعة من المعلومات عن الحدث نفسه، وعن ظواهر اجتماعية وسياسية تخص مدينة أربيل في أواخر العشرينيات ومطلع الثلاثينيات، وهي معلومات موثقة مصدرها الأساس ملفات وزارة الداخلية في اواخر عهد الانتداب البريطاني.



# رەنگ دانەوەی کێشەی نێودەوڵەتان لە نێوان عوسمانی و ئێران دا لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم داو کورتەیەك لە بارودۆخی کوردستانی ئەو سەردەمە

د. حسن جاف

ئەوەی ئاشکرایە سیاسەتی ئینگلیز لە نیمەی یەکەمی سەدەی نوزدەهەم دا ئەوە بووە کە هەرگیز نەهێڵن رووسەکان بگەیەنە هیندستان ومەوداشیان نەدەن لەئێران و ئاسیای ناوین دا رەگ داکوتن چونکە بۆ داگیرکردنی ئەم وڵاتانە رێگای داگیرکردنی هیندستانیان بۆ مسوگەرو هەموار دەبێ بۆ ئەم نیازەش ئینگلیزەکان کەوتنە خۆ بۆ ئەوەی تەبایی وئاشتی لە نێوان روسیاو ئێران دا بچەسپێنن بە تایبەت پاش زاڵ بوون سوپای رووس لە شەرەکانی ساڵانی ١٨٠٤ تا ١٨٢٨زدا چونکە ئینگلیزەکان بە رۆن دەیان زانی لەشکری ئێران بەرگەی لێشاوی سوپای ڕووس ناگرێت. وبەداگیرکردنی ئێران هیندستان دەکەوێتە مەترسی داگیرکردنی روسەکانەوە بۆ ئەم مەبەستە کەوتنە هەوڵ دانەوە کە ئاشتی و صلح لە نێوان ڕووس و ئێران دا بچەسپێنن[1] لە کاتێك دا ئەو سەردەمە فەرەنساوی یەکان دەکۆشان یەکێتی لە نێوان ئێران و عوسمانی پێك بێنن و پێکەوە لە دژ رووسەکان بوەستن[2].

هەوڵ و تەقەلای باڵیوزە ناسراوەکانی ئینگلیز، وەك سیرگور ئوزلی[3] سیرجون ماکدۆناڵد گەیشتە ڕادەیەك کە شەڕ ڕاگیری و پەیماننامەی گوڵستان و توورکمان چای[4] مۆربکرێ ئەم هەڵپەو تەقەلایەش لە پێناوی ئەوەدا بوو نەیەڵن ئێرانیان لە دەس بڕوا.

ئەوەی روونە ئەم رکەبەری و پێشبڕکی یەی نێوان ڕووس و ئینگلیز تا ساڵی ١٨٩٢ بەردەوام بووە هەر لەم ساڵەدا دەوڵەتی روسیا هاتەسەر ئەو بڕوایە کە پێویستە لە تەك ئینگلیزەکان دا هاوکاری بکات لە ئێران و ئاسیای ناوین دا ئەمەش لە پێناوی دابین کردنی سودو قازانجی ئیمپریالیستی یان لە هەردو ناوچەکەدا.

ئەم هاوکاری یەش، پاش پەرەسەندنی هێزی ئازادیخوازو شۆڕشگێرانی نەتەوەکانی ئێران و ناوچەکانی دیکە، لە پەیمان نامەی ١٨٠٧ زداوەبەرهات[5].

ئەی باری سیاسیی ڕووس و ئینگلیز لەمەڕ دەوڵەتی عوسمانی، لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم دا چۆن بوو؟ وەك ڕوونە، پێوەندیی نێوان ڕووسیاو عوسمانی، لەم قۆناغەدا باری تەبایی و خواسایی بە خۆیەوەنەدیوە، چون ڕووسەکان لە بارودۆخی ئاڵۆزی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵەکی ی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، بە ڕوون ئاگابوون و کەوتوونە هەڵپەو تەقەلای ئەوەوە ناوچەکانی عوسمانی داگیربکەن و دەست لە بارودۆخی ناوەکی یان وەردەن، بەڵام ئینگلیزەکان هەمیشە لە دژ سیاسەتی داگیرکەرانەی ڕووسان، بەرانبەر بە دەوڵەتی وەستاون، چونکە ئینگلیز نەیان دەویست ڕووسەکان

بنەیەکە ..واری مەیدانی داگیرکردنی ولاتانی عوسمانی. ئەم سیاسەتەش، ئەوە بوو، بە مایەی شەرهەلگیرسان لە نێوان رووسیاو عوسمانی دا، کە پوپەکەی شەری کریما بوو (قرم)و لەم شەرەش دا ئەوەبوو، ئینگلیزو فەرەنسە بە هاواری دەولەتی عوسمانی یەوە هاتن و رووسیای قەیسەری لەم شەرەدا شکستی خواردو پەیماننامەی پاریس لە نێوان دەولەتە شەرکەرەکان دا مۆرکرام[6].

باشە ئەی ئەم کێشمەکێشە لە بارەی کوردستان چۆن تیشکی داوەتەوە؟

لە سەردەمی شەری نێوان ئێران و رووسیادا پێوەندیی نێوان دەولەتی عوسمانی و دەولەتی ئێران خواسایی بوو، بەلام پاش سالی ١٨١١ز کاتێ رووسەکان توانی یان لەشکری ئەحمد پاشا لە دەوروبەری رووباری تونە (رۆن)بە سەختی بشکێنن و عوسمانی یەکان ناچاربکەن، لە ٢٧ حوزەیرانی ١٨١١ زدا، پەیمان نامەی بوخارست مۆربکەن. مۆرکردنی ئەم پەیمان نامەیە بوو بە مایەی ساردوسریی نێوان ئەم دوو دەولەتەو رۆژ بەدگومانی هەردوو دەولەت بەرانبەر بە یەکتری خەست و خۆل تر دەبۆوە[7].

بێ گومان شوێن پەنجەی دەستەسیاسی و سەربازی یە بیانی یەکان لە خەست کردنەوەی ئەم ناکۆکی یەدا زۆر دیارو ئاشکرابوو جگە لە دەوری ئەمانە، مەسەلەی ئازارادانی حاجی یە ئێرانی یەکان، کە بۆ زیارەتی کەربەلاو نەجەفی پیرۆزدەهاتن و هەروەها گیروگرفت و وکێشەی سەرسنووران و هێرشی وەهابی یان بۆسەر کەربەلاو بە کۆمەل کوشتنی خەلکی شارەکە (١٣ی مایسی ١٨٠٢ز)و پەنادرانی جەعفەر قولیخانی دونبولی لە لایەن دەولەتی عوسمانی یەوە وکێشەی فەرمانرەوایی هەردوو دەولەتەکە بۆ وەسەرراگەیشتنی میرنشینی بابان و ئەردەلان هۆکاری بنەرەتی ی شەروشۆری نێوان ئەم دوو دەولەتەبوون[8].

فەتح عەلیشا، داوای لە سلێمان پاشا، والیی گەورەی بەغداکرد، کە وەهابی یان بەسزای خۆیان بگەیێنێ. سلێمان پاشا نەپەرژایە سەر ئەوە کەشتێ بە شتێ بکا کۆچی دوایی کرد (١٨٠٢ز)[9] بەلام کاتێ عەلی پاشای زاوای هاتە سەر کارو بە پێچەوانەی سلێمان پاشاوە، رەفتاری لە تەك ئێران دا دۆستانە نەبوو. ئەوەبوو لە ئاکامی رەفتاری ملهورانەو ناسیاسی یانەی خۆی، هێندەی نەما نێوان هەردوو دەولەتی ئێران و عوسمانی بە تەواوەتی تێك بدا. شالاوی بردەسەر میرنشینی بابان. عەبدورەحمان توانی بەرەنگاربوون، لە خۆی دا نەبین، لە دوادوای ئابی ١٨٠٥دا خۆی گەیاندە کوردستانی ئێران و بوو بە پەنابەری ئەمانوللاخان[10] والی سنە[11]. فەتح عەلیشا داوای لەعەلی پاشاکرد کەمەودای عەبدورەحمان پاشابدا بگەرێتەوە بۆ میرنشینی بابان بەلام عەلی پاشا داخوازی یەکەی شای پشت گوێ خست. محمد علی میرزا (دەولەتشا، کوری فەتح عەلی پاشا) لە سەرەتای ربیع الاول، ١٢٢١ك، دوادوای ١٨٠٦ بەلەشکرێکەوە، بەنیازی داگیرکردنی بەغدا، بەرێ کەوت. لەشکری عەلی پاشا بە سەرکردایەتیی سلێمان پاشای خوشکەزای، لە لایەن عەبدورەحمان پاشای بابانەوە، نزیك گوندی گۆزەگەورە، لەمەریوان شکستی خواردو بەدیل گیراو جارێکی دیکەعبدالرحمن پاشا گەرایەوە بۆ سلێمانی[12] پاش ماوەیەك، یوسف پاشا، والیی ئەرزەرۆم، کە نێوانی لەگەل ئێرانی یەکان دا خۆش بوو، فەیزی محمودی بۆ ئێران، نارد، بۆ ئازادکردنی سلێمان پاشای خواستەکەی یوسف پاشا جێی خۆی گرت و سلێمان پاشا ئازادکراو هەردوو دەولەتیش لەسەر ئەوە رێك کەوتن کە لە دژ رووس بوەستن[13].

لە راستی دا ئەوەی کە ئێمە پێویستە لێرەدا ئاماژەی بۆ بکەین ئەوەیە، کێشەی دەولەتەئەوروپایی یەکان، رووسیاو بەریتانیا وفەرەنسا ئایا لە نێوکورددا رەنگی دابۆوە؟ ئێمە لەو بروایەداین کە کێشمە کێشی ولاتە ئەوروپایی یەکان لەدژ سەردەمەدا رەنگی نەداوەتەو. بەلام بێ گومان کورد بوو بوو بە مایەی بەربەرەکانێ لە نێوان و عوسمانی دا. کاربەرەو ئەوەی کێشاوەتەوە کە هەریەکە کوردەکان بەلای خۆی دا رابکێشێ و بۆ بەکارهێنانیان لە بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان. ئەوانیش هەر کە هەستیان لێیان بە مەترسی کردبێ، دەستیان لەکاروباروەزداوەو لەدژ یەکیان راکردوون[14].

ئەگەر تاك وتەرایەك لە بیانی یان، وەك جێمس ریچ (١٨٢٠)و هنری راولنسون Henty Rawlinson وچەند کەسێکی تر، باسی کوردیان کردبێ، یاویستییان هەستی نەتەوەیی یان تێدا بە ئاگابێنن، لە کارێکی تاکانەی خۆیان بەولاوە نەچووە لەسەر بەرنامەی دەولەتەکانیان نەرۆیشتوون.

نابێ ئەوەشمان لە بیربچێ کە ئەوروپایی یەکان بە تایبەت رووسەکان لەسەرەتای سەدەی نۆزدەمەوە زۆریان لە سەر کوردو کوردستان ومێژووو جوغرافیاو زمان و ئەدەب و فۆلکلوری کورد کۆلیوەتەوە، بەلام پتر لایەنی سەربازی و لەشکرکێشی یان لە بەرچاوگرتووە. ئەرشیفەکان، رووس پرن لە زانیاریی بە نرخ لەم رووەوە[15].

هەروەها برێ گەریدەی ئەوروپایی وەك: بازرگانی ئەنەدیکی ی بێ ناو لە سەدەی ١٦هەم داو ویستەر ئافۆنس Meitne Aftons لە سەدەی ١٦هەم داو پێترۆ دێ لافال Petro Dely valie لە سەدەی ١٧هەم داو جین ئیفنۆت لە (١٦٣٣ - ١٦٦٧)دا گەشتی کوردستانیان کردووەو شتی زۆریان لەسەر کوردو کوردستان نووسیوە[16] بەلام هیچ بۆنێکی سیاسی یان پێوە دیار نی یە.

ئەوەی ئاشکرایە، لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم دا پێشبرکێ یەکی ئاشکرا دەکەوێتە نێوان رووسیاو ئینگلستانەوە، چونکە فەرەنسە پاش مردنی ناپلیۆن بۆناپارت نەخشەیەکی ئەوتۆی بۆ داگیرکردنی ئێران و عوسمانی بەدەستەوە نەما. لەم قۆناخەدا دەبینین ئینگلیزەکان تێ دەکۆشن نەیەلن رووسەکان ناوچەکانی ئیمپراتۆری یەتی عوسمانی و دەولەتی

ئێران داگیرکەن و هەمیشە سیاسەتی ئینگلیز ئەوە بوو کە حوکوومەتی عوسمانی کە بەپیاوە نەخۆشەکەیان ناودەبرد بەسەربمێنێتەوە. لەبەر ئەمە دەبینین ئینگلیزەکان بەرانبەر بە شۆرشەکانی کورد، وەك شۆرشی بەدرخان پاشاو شۆرشی میرمحمدی (پاشای کۆرە) رەوانـدز دژ دەوەستن، هەرچی رووسەکانیش بوون پتر ئەرمەنی یەکـانیان لا مەبەست بوو، نەك کورد. لەبەر ئەوە کاتێ دەسەلاتی میرمحمدی رەواندزی دەگاتە ئەوەی، کە ناوچەکانی کوردستانی ئێران داگیربکا، هاواربۆ رووسەکان دەبا(١٧)

لەم سەرێشەوە ئینگلیزەکان بە ئاشکرا یارمەتی هێزەکانی رەشید شایان دا(١٨) ئەم هەڵوێستەی رووس و ئینگلیزی بە تایبەتی لە شۆرشی بەدرخان بەگ دا زۆر بەزەقی بەدیاردەکەوێ(١٩).

ئینگلیزەکان کاتێ کەزانی یان هێزی بەدرخان بەگ مەترسی یەکی راستەقینەی بۆ حوکوومەتی عوسمانی هێناوەتە گۆرێ دام و دەزگای موخابەراتیی یان دەکەونەخۆ دەبنە چاوساغی حوکوومەتی عوسمانی بۆ لەناودانی دەسەلاتی میری حریروبۆتان زەوینەخۆش کردن بۆ پاساودانی لە ناوبردنی بەدرخان بەگ لە هەڵوێستی بەستووری یەکان و کوشت و کوشتاریان دا لە لایەن بەدرخان بەگەوە، کە ئینگلیزو فەرەنسەو ئەمەریکایی کان بوونە هۆی رووداو، بەدیاردەکەوێ. (٢٠).

میر محمد لە ئێرانی خواست یارمەتیی بدات، بەلام ئێران خۆی، لە خواستەکەی میرمحمـدکەرکـرد، یەکـەم: ئێران خـۆی کەوتبـووە خۆئامادەکەردن لە دژ میرمحمد، کە پەلاماری سنوورەکان دەداو هەوڵی ئەدا هۆزە کوردەکانی ئێران بخاتە ژێر دەسەلاتی خۆی، دووەم: بەریتانیاو رووسیا دژی ئەوە بوون ئێران لە میرمحمد نزیك بێتەوە ئەودوو دەوڵەتەش لەو سەردەمەدا دەستیان بەسەر ئێران و تورکیادا دەرۆیشت(٢١) ئێران نزیکەی دە هەزارکەسی نارده سەرکوردەکان، لەوانە بەشێکی باشیان نیزامی بوون. ئینگلیزەکانیش حەزیان لە تێداچوونی بزووتنەوەی کوردان دەکرد. بۆ ئەم مەبەستەش زۆر بە گەرمی هاتەئاراوە. هەوڵیان دا تورکیاو ئێران دژی کورد یەك بخەن، بە هەموو جۆرێ تێ دەکۆشان ناخۆشیی نێوان تورکیاو ئێران نەهێڵن ئاشتیان کەنەوە(٢٢).

هەروا پەرەسەندنی دەسەلاتی بەدرخان بەگ بەرادەیەك گەیشت بە ترس و تالووکەی لە ئیمپراتۆری یەتی عوسمانی جۆی بوونەوە هێنایە گۆرێ، بگرە دەولـەتە ئـەوروپایی یـەکانیشی تـۆقانـد، چونکـە ناراستەوخۆ هەرەشـەی لە بـەرژەوەندی سیاسی و ئابووری یان دەکرد(٢٣).

هەڵوێستی ئینگلیزەکان لە شۆرشی یـەزدان شێردا، لـە سالی ١٨٥٣زدا هـەر ئەو هـەڵوێستـە دوژمنایـەتیـەبـوو کـە لـە دژی بەکاریان هێنا(٢٤).

ئینگلیز هەمیشە لەکاتی تالووکەو ناسك دا فریای تورك و عەجەم کەوتوون و هەڵدوێریان رزگارکردوون. ئـەوەتا کـاتێکی مامیت (مەحمەد)پاشا، فەرماندەی هێزەکانی تورك لە لای گوندی (دیربان)، نزیکی شاری جزیر راپەربوان ناچاری پاشەکشێ کرد کۆنسولی ئینگلیز لە مووسل دۆخەئالۆزەکەی بە هەل زانی، کەوتە لووت تێ وەژەندنی کارەکە. . بە بەڵێن و پارەبەشینەوە چەند سەرۆکێکی کوردی کری و دەسەبەرکردو لەگەڵ کاربەدەستانی تورك ئاشتی کردونەوە لەبەر ئەمە یەزدان ناچاربوو، بەخۆی و بنە ماڵەکەیەو بکشێتەوە بۆ قەلای (گاسرا ـ گیل) لە خواروانەوە.

## سەرچاوەو پەراوێز

(١) ئەبوقیر رۆژی یەکەمی ئاب ١٧٩٨ز، دەریاسالاری ئینگلیزی نیلسۆن، گەیشتە کەنداوی ئەبوقیر گەلەکەشتی فەرەنسەی، کە لەوێ لەنگەریان هاویشتبوو لە پاش شەرێکی سەخت تێکشکاند لە نێوان یازدەکەشتیی شەرکەری فەرەنسەدا تەنها چوار کەشتی توانی یان هەڵێن بۆ مالتا، ئیدی سەرلەبەری کەشتی یەکان یا سووتان یا نوقم بوون یا بەدیل گیران ئەم شکستی یەی شەری دەریایی بە پێوەندیی هێزەکانی فەرەنسەی لە میسردا لەگەڵ فەرەنسەدا پچری.

(٢) پۆل یەکەم لە شەوی ١٢/١١ی مارت سالی ١٨٠١زدا لە ئەنجامی پیلانێك دا لە دەرباری خۆی، کە ئینگلیزەکان دەستیان تێدابووە، کوژرا، چونکە ئینگلیزەکان نەیان دەتوانی هاوکاریی پۆل لەگـەڵ سەرسەخت ترین دوژمنیان دا، کە ناپلیۆن بوو، بۆ قووت بچێ.

بروانە: د. کمال مظهر: دراسات في تاریخ ایران الحدیث والمعاصر، د. کمال مظهر بغداد، ١٩٨٥، ص٣٠.

(١) د. کمال مظهر دراسات في تاریخ ایران الحدیث والمعاصر بغداد ١٩٨٥ ص٧١.

(٢) هەمان سەرچاوە ص٣٥.

(٣) نەخشی سێر گور ئوزلی لە بەستنی پەیمان نامەیی گولستان دا بە رادەیەك درەخشان بووە کە قـەیسەری رووس نیشـانی بەرزی رووسیایی پێ ببەخشێ بەلام ئینگلیزەکان بە تەگبیرێکی زیرەکانە ناوبراویان لە وەرگرتنی دەس بەردار کرد بروانە: گۆڤاری. . برسیهای تاریخی ژ ٣ سالی ١١ ئاب، ئەیلول ١٩٧٨ ص٣٩.

(٤) پەیمان نامەی گولستان لە (٢)ی تەشرینی یەکەمی ١٨١٣داکە نێوان ئێران و رووسیادا بەسترا بە پێی ئەم پەیمان نامەیە ئێرانی خان نشینی قەرەباغ و گنجەو شیراون و شەکیی و باکوی لە دەست دا پەیمان نامەی تورکمان چای لە ٢٢ شوباتی ١٨٢٨ زدا لە نێوان روسیاو ئێران دابەستراو بە پێی ناوەرۆکی ئەم پەیمان نامەیە هەموو ناوچەکانی قەفقاز بوو بە مۆلکی رووسیاو رووباری ئاراز بوو بە سنوری نێوان رووسیاو ئێران بروانەند محمد عبدالله العزاوي: الصراع البریطاني الروسي في فارس ١٨٠٩ ـ ١٨٣٩ مجلة الخلیج العربي العدد السادس السنة ١٩٨٨ ص٦٠ ـ ٧١.

(٥) د. نوري عبدالسامرائي ـ هەمان سەرچاوە، ص٧٧.

ئێران داگیرکەن و هەمیشە سیاسەتی ئینگلیز ئەوە بوو کە حوکومەتی عوسمانی کە بەپیاوە نەخۆشەکەیان ناودەبرد بەسەربمێنێتەوە. لەبەر ئەمە دەبینین ئینگلیزەکان بەرانبەر بە شۆرشەکانی کورد، وەك شۆرشی بەدرخان پاشاو شۆرشی میرمحمدی (پاشای کۆرە) رەواندز دژ دەوەستن، هەرچی رووسەکانیش بوون پتر ئەرمەنی یەکانیان لا مەبەست بوو، نەك کورد. لەبەر ئەوە کاتێ دەسەلاتی میرمحمدی رەواندزی دەگاتە ئەوەی، کە ناوچەکانی کوردستانی ئێران داگیربکا، هاواربۆ رووسەکان دەبا[17]

لەم سەریشەوە ئینگلیزەکان بە ئاشکرا یارمەتی هێزەکانی رەشید شایان دا[18] ئەم هەلوێستەی رووس و ئینگلیزی بە تایبەتی لە شۆرشی بەدرخان بەگ دا زۆر بەزەقی بەدیاردەکەوێ[19].

ئینگلیزەکان کاتێ کەزانی یان هێزی بەدرخان بەگ مەترسی یەکی راستەقینەی بۆ حوکومەتی عوسمانی هێناوەتە گۆرێ دام و دەزگای موخابەراتیی یان دەکەونەخۆ دەبنە چاوساغی حوکومەتی عوسمانی بۆ لەناودانی دەسەلاتی میری حریروبۆتان زەوینەخۆش کردن بۆ پاساودانی لە ناوبردنی بەدرخان بەگ لە هەلوێستی بەستووری یەکان و کوشت و کوشتاریان دا لە لایەن بەدرخان بەگەوە، کە ئینگلیزو فەرەنسەو ئەمەریکایی کان بوونە هۆی روودانی، بەدیاردەکەوێ. .[20].

میر محمد لە ئێران خواست یارمەتیی بدات، بەلام ئێران خۆی، لە خواستەکەی میرمحمدکەرکرد، یەکەم: ئێران خۆی کەوتبووە خۆئامادەکەردن لە دژ میرمحمد، کە پەلاماری سنوورەکان دەداو هەولی ئەدا هۆزە کوردەکانی ئێران بخاتە ژێر دەسەلاتی خۆی، دووەم: بەریتانیاو رووسیا دژی ئەوە بوون ئێران لە میرمحمد نزیك بێتەوە ئەودوو دەولەتەش لەو سەردەمەدا دەستیان بەسەر ئێران و تورکیادا دەرۆیشت[21] ئێران نزیکەی دە هەزارکەسی ناردە سەرکوردەکان، لەوانە بەشێکی باشیان نیزامی بوون. ئینگلیزەکانیش حەزیان لە تێداچوونی بزووتنەوەی کوردان دەکرد. بۆ ئەم مەبەستەش زۆر بە گەرمی هاتنەئاراوە. هەولیان دا تورکیاو ئێران دژی کورد یەك بخەن، بە هەموو جۆرێ تێ دەکۆشان ناخۆشیی نێوان تورکیاو ئێران نەهێلن ئاشتیان کەنەوە[22].

هەروا پەرەسەندنی دەسەلاتی بەدرخان بەگ بەرادەیەك گەیشت بە ترس و تالووکەی لە ئیمپراتۆری یەتی عوسمانی جۆی بوونەوە هێنایە گۆرێ، بگرە دەولەتە ئەوروپایی یەکانیشی تۆقاند، چونکە ناراستەوخۆ هەرەشەی لە بەرژەوەندی سیاسی و ئابووری یان دەکرد[23].

هەلوێستی ئینگلیزەکان لە شۆرشی یەزدان شێردا، لە سالی ١٨٥٣زدا هەر ئەو هەلوێستە دوژمنایەتیەبوو کە لە دژی بەکاریان هێنا[24].

ئینگلیز هەمیشە لەکاتی تالووکەو ناسك دا فریای تورك و عەجەم کەوتوون و هەلدویریان رزگارکردوون. ئەوەتا کاتێکی مامیت

(محمد)پاشا، فەرماندەی هێرەکانی تورك لە لای گوندی (دیربان)، نزیکی شاری جزیر راپەریوانی ناچاری پاشەکشێ کرد کۆنسولی ئینگلیز لە مووسل دۆخەئالۆزەکەی بە هەل زانی، کەوتە لووت تێ وەژەندنی کارەکە. . بە بەلێن و پارەبەشینەوە چەند سەرۆکێکی کوردی کری و دەسەبەرکردو لەگەل کاربەدەستانی تورك ئاشتی کردونەوە لەبەر ئەمە یەزدان ناچاربوو، بەخۆی و بنە مالەکەیەو بکشێتەوە بۆ قەلای (گاسرا - گیلی) لە خوارووانەوە.

## سەرچاوەو پەراوێز

(١) ئەبوقیر رۆژی یەکەمی ئاب ١٧٩٨ز، دەریاسالاری ئینگلیزی نیلسۆن، گەیشتە کەنداوی ئەبوقیر گەلەکەشتی فەرەنسەی، کە لەوێ لەنگەریان هاویشتبوو لە پاش شەرێکی سەخت تێکشکاند لە نێوان یازدەکەشتیی شەرکەری فەرەنسەدا تەنها چوار کەشتی توانی یان هەلێن بۆ مالتا، ئیدی سەرلەبەری کەشتی یەکان یا سووتان یا نوقم بوون یا بەدیل گیران ئەم شکستی یەی شەری دەریایی یە پێوەندیی هێزەکانی فەرەنسەی لە میسردا لەگەل فەرەنسەدا پچری.

(٢) پۆلی یەکەم لە شەوی ١١ /١٢ی مارتی سالی ١٨٠١زدا لە ئەنجامی پیلانێك دا لە دەرباری خۆی، کە ئینگلیزەکان دەستیان تێدابووە، کوژرا، چونکە ئینگلیزەکان نەیان دەتوانی هاوکاریی پۆل لەگەل سەرسەخت ترین دوژمنیان دا، کە ناپلیۆن بوو، بۆ قووت بچێ.

بروانە: د. کمال مظهر: دراسات في تاريخ ايران الحديث والمعاصر، د. کمال مظهر بغداد، ١٩٨٥، ص٣٠.

(١) د. كمال مظهر دراسات في تاريخ ايران الحديث والمعاصر بغداد ١٩٨٥ ص٧١.

(٢) هەمان سەرچاوە ص٣٥.

(٣) نەخشی سێر گور ئوزلی لە بەستنی پەیمان نامەیی گولستان دا بە رادەیەك درەخشان بووە کە قەیسەری رووس نیشانی بەرزی رووسیایی پێ بیەخشێ بەلام ئینگلیزەکان بە تەگبیرێکی زیرەکانە ناوبراویان لە وەرگرتنی دەس بەردار کرد بروانە: گوڤاری. . برسیهای تاریخی ژ ٣ سالی ١١ ئاب، ئەیلوول ١٩٧٨ ص٣٩.

(٤) پەیمان نامەی گولستان لە (٢)ی تەشرینی یەکەمی ١٨١٣داکە نێوان ئێران و رووسیادا بەسترا بە پێی ئەم پەیمان نامەیە ئێران خان نشینی قەرەباغ و گنجەو شیراون و شەکیبی و باکوی لە دەست دا پەیمان نامەی تورکمان چای لە ٢٢ شوباتی ١٨٢٨ زدا لە نێوان روسیاو ئێران دابەستراو بە پێی ناوەرۆکی ئەم پەیمان نامەیە هەموو ناوچەکانی قەفقاز بوو بە مۆلکی رووسیاو روباری ئاراز بوو بە سنوری نێوان رووسیاو ئێران بروانەند محمد عبدالله العزاوي: الصراع البريطاني الروسي في فارس ١٨٠٩ - ١٨٣٩ مجلة الخليج العربي العدد السادس السنة ١٩٨٨ ص٦٠ - ٧١.

(٥) د. نوري عبدالسامرائي - هەمان سەرچاوە، ص٧٧.

(٦) بروانه د. محمد عبدالله العزاوي: موقف بريطانيا من التوسع الدرس في ايران واسيا الوسطى خلال النصف الثاني من قرن التاسع عشر مجلة الدراسات الايرانية المجلد الاول العدد الاول والثاني ١٩٩٣ مركز الدراسات الايرانية جامعة البصرة ص٦٥.

(٧) بۆزانینی پتر دەربارەی ئەم پەیمان نامەیە بروانە پەرتووکی: بدرخان محمد على السلطان عبدالحميد الثاني، رمادي ١٩٨١ ص٣١ - ٣٢

(٨) بروانه د. علي بنيا: تاريخ سياسي ودبلوماسي ايران ج١ ص١٧٦

(٩) د. عبدالعزيز سليمان نوار: تاريخ الشعوب الاسلامية في العصر الحديث ج١ بيروت ١٩٧١ ص١٩٦ وكذلك انظر ،د. محمد رضا نصيري: استاذ مكاتبات قاجارية تهران ١٣٦٨هـ ص١٤.

(١٠) بروانه د. علي الوردي لمحات اجتماعية من تاريخ العراق والحديث ج١ بغداد ١٩٦٩ ص١٨٤ - ١٩١.

(١١) یەکێ لە حکم ڕانە ناسراوەکانی میرنشینی ئەردەلانە پاش میر حسن علي خان لەساڵی ١٣١٤هـ بووبەوالی ئەردەلان ساڵی ١٣٤٠هـ کۆچی دوایی کرد. بروانه محمد مردوخ کردستان تاریخ مردوخ ج١ چاپ دووەم تهران ١٣٥١ ص١٤٩ - ١٥٩.

(١٢) سنە پایتەختی میرنشینی ئەردەلان بوە.

(١٣) بروانه محمد امين زكي تاريخى سليمانى وولاتى بەغدا ١٩٣٩ ص١٠٦.

(١٤) بروانه گوڤاری بررسیهای تاریخی شمارە (٢) سالی ١٠ ص٢٣.

(١٥) كلوديوس جيمس ريج: رحلة ريج في العراق عام ١٨٢٠ ترجمة بهاءالدين نوري بغداد ١٩٥٧ ص٢٢٩.

(١٦) د. جەلیلی جەلیل: کوردەکانی ئیمبراتۆریەتی عوسمانی، وەرگێر د.کاووس قەفتان بەغدا ١٩٨٧ ص٩ - ١٢.

(١٧) د. عصمت شريف دانلو: کوردو کوردستان لە نیگای چەند گەریدەیەکی ڕۆژاوایی یەوە وەرگێر شەکور مستەفا، گوڤاری کۆری زانیاری عیراق، دەستەی کورد، بەرگی هەشتەم بەغدا ١٩٨١ ص ١٢١ - ١٥٩.

(١٨) هەمان سەرچاوە.

(١٩) سەعید بەدەل «صادق شەرفکەندی» تاریخ جنبشهای ملی کورد ١٣٦٠ ص١٤ - ١٥.

(٢٠) د. جەلیلی جەلیل: سەرچاوەی پێشوو ص١٧٦.

(٢١) عەلاءالدین سەجادی شۆرشەکانی کورد، بەغدا ١٩٥٩ ص٤٤ - ٤٥.

(٢٢) سەعید بەدەل: سەرچاوەی پێشوو ص١٩. هەروا بروانە کریس کوچیرا مێژووی کورد لە سەدەی ١٩ - ٢٠دا وەرگێر، محمد ربانی تهران ١٣٦٩ ص٤١ - ٤٩.

(٢٣) جەلیلی جەلیل: سەرچاوەی پێشو ص١٨٥.

(٢٤) بروانه عەلاءالدین سەجادی شۆڕشەکانی کورد ص٤٥ - ٤٦

## ملخص البحث:

# انعكاس الصراع الدولي على العلاقة بين الدولتين العثمانية والايرانية في بداية القرن التاسع عشر ونبذة موجزة عن وضع كردستان في تلك الفترة.

الدكتور: حسن الجاف

كانت سياسة بريطانيا في النصف الاول من القرن التاسع عشر تلح بل تجزم على منع الروس من الوصول الى الهند من جهة وتثبيت اقدامهم في ايران وبلدان الشرق الاوسط حتى لايكون احتلالهم للبعض منها واسطة للتقرب من الهند.. وفي هذه الاثناء وقعت بين ايران وروسيا حرب استمرت من سنة ١٨٠٤ حتى سنة ١٨٢٨ وكان الانكليز يدركون بأن ايران لاتقوى على التصدي للغزو الروسي، وخوفاً من تقدم روسيا في أراضي ايران عمل الانكليز على عقد صلح بين إيران وروسيا وكان الفرنسيون يسعون من جهة اخرى الى اتحاد الدولة العثمانية مع ايران للوقوف بوجه اطماع روسيا اما روسيا فرأت من نهاية حومة صراعها مع بريطانيا الذي استمر لغاية سنة ١٨٩٢ بان عليها الاتفاق مع بريطانيا ولاسيا في ايران والشرق الاوسط وكل ذلك بالطبع في سبيل تحقيق الاطماع الامبريالية لهذه الدول.. لكن بريطانيا بقيت على حذر من سياسة روسيا تجاه الدولة العثمانية والتي بنيت على اساس التوسع والاستحواذ على مكاسب مهمة من الدولة المريضة، حتى وقعت حرب القرم بين الدولتين والتي انهزمت فيها القوات الروسية نتيجة مناصرة كل من بريطانيا وفرنسا للدولة العثمانية.. وانعكست هذه الصراعات الدولية على الوضع بين ايران وتركيا فكان الصراع محتدماً ومستمراً بينهما ويزداد نتيجة تدخل الأيادي الأجنبية سياسياً وعسكرياً، ويتجدد لوجود مشاكل حدودية بين الدولتين ووجود امارات كردية في المنطقة، فكانت الحرب تقع بين قوات والي بغداد والقوات الايرانية وبينها وبين امارتي بابان واردلان واصبح الشعب الكردي ركناً اساسياً في هذا الصراع، اذ تحاول كل من الدولتين استمالته الى جانبها آناً والتعاون فيما بينهما ضده عند شعورهما بخطر ينبعث منه وتدخلت الدول الاوربية ولاسيا بريطانيا في الأمر، حيث ظلت الأخيرة تحاول اصلاح ذات البين بين تركيا وايران وتقف ضد الحركة التحريرية الكردية.. فكان هذا موقفها من حركة محمد باشا الراوندوزي، امير إمارة سوران وكذلك من حركة البدرخانيين في جزير وبوتان.

# پاشبەندی (ێ)

## لە ڕەخنەی ناڕەخنەدا



د. پرۆفیسۆر وریا عمر امین
بەشی کوردی ـ زانکۆی بەغداد

د. ئاورەحمان حاجی مارف لە باسێکیدا[1] وای لە قەڵەم ئەدات کە من هەندێ بابەتی زمانەوانی ی مامۆستا مسعود محمدم وەرگرتووە. . . و. . . کردوومە بە ماڵی خۆم و ناویم وەك سەرچاوە نەهێناوە.

وەك دەرئەکەوێ د. ئاورەحمان لە گەڵ ڕێزم بۆی لە سروشت و ئەنجامی باسەکانی مامۆستا مسعود محمد و هی من نەگەیشتووە. . ئەگینا شتی تری بۆ دەرئەکەوت.

بە زنجیرەیێك وتار یەکە یەکە موناقەشەیەکی زانستی ی هەموو ئەو ڕەخنانەی د. ئاورەحمان ئەکەم بۆ دەرخستنی ڕاستی کە لای ئاگاداران ئاشکرایە.

یەکەم وتارمان لە بارەی پاشبەندی (ێ)وە ئەبێ، کە مامۆستا مسعود محمد لە کتێبی (چەند حەشارگەیێکی ڕێزمانی کوردی)[2] دا و من لە وتاری (پاشبەندەکان)[3]دا، باسی ئەکەم. . بەلای د. ئاورەحمانەوە مامۆستا مسعود یەکەم کەسە باسی ئەم پاشبەندەی کردووە. . و. . من لەوم وەرگرتووە. .

★ ★ ★ ★ ★

یەکەم کەس باسی ئەم پێشبەندەی کردبێ (ئەدمۆنس)ە لەساڵی ١٩٥٥ دا لە وتارێکیدا بە ناوی (پێشبەندو ڕاناوی لکاو لە کوردی ی خوارووودا)[4]. دوای ئەم لە ساڵی ١٩٦١ دا د. مەکەنزی [5] باسی ئەم پێشبەندە ئەکات. . بەڵام هیچ کامێکیان یاساکەیان دەست نیشان نەکردووە. لەوانەیە مامۆستا مسعود محمد ئاگاداری ئەم سەرچاوانە نەبووبێ. . ئەمیش لە لای خۆیەوە هەوڵی داوە ئەم دیاردەیە لێك داتەوە. . ئەمیش نەگەیشتۆتە ئەنجام.

لە ساڵی ١٩٨٦ لە وتاری (پاشبەندەکان)دا. یاسای دەرکەوتنی (ێ)م زۆر بە چڕی پێشکەش کردووە. . لێرە بە شێوەیەکی فراوانتر پێشکەشی ئەکەمەوە و لەگەڵ بۆ چوونەکەی مامۆستا مسعود محمددا بەراوردی ئەکەم بۆ دەرخستنی جیاوازی نێوان ئەم دوو باسە.

★ ★ ★ ★ ★

دەرکەوتنی پاشبەندی (ێ) بە شێکە لەیاسای ڕێزمانی ڕاناوی لکاو. بۆیە سەرەتا ئەبێ ئەم لایەنەی ڕێزمانی کوردی بخرێتە ڕوو.

زمانی کوردی[6] دوو دەستە ڕاناوی لکاوی هەیە. بە پێ ی کەس و ژمارە لەم نەخشەیەدا روون کراوەتەوە:

| ژمارە | کەس | جو دا | لکاو ١ | لکاو ٢ |
|---|---|---|---|---|
| تاك | ١ | من | م | م |
| | ٢ | تۆ | ت | یت |
| | ٣ | ئەو | ی | [illegible] |
| کۆ | ١ | ئێمە | مان | ین |
| | ٢ | ئێوە | تان | ن |
| | ٣ | ئەوان | یان | ن |

کەسی سێ یەمی تاك لە کۆمەڵی (٢)دا بۆ ڕابردوو هیچ قاڵبێکی ئاشکرای overt form ی نی یە. لە داهاتوودا [ێت ات][7] دەرئەکەوێ.

ئەم دوو دەستەیە هەردوو دەوری بکەری و بەرکاری لە دوو کاتی دژیەکا ئەبینن. بە پێ ی ئەم یاسایە:




. . . یاسا(١)




| داهاتوو: (١) بکەر (٢) بەرکار | ڕابردوو: (١) بکەر (٢) بەرکار |
|---|---|
| دە ـ م ـ نێر ـ یت | دە ـ ت ـ نارد ـ م |
| دە ـ ت ـ نێر ـ م | دە ـ م ـ نارد ـ یت |
| دە ـ ی ـ نێر ـ ێت | دە ـ ی ـ نارد ـ ∅ |
| دە ـ مان ـ نێر ـ ن | دە ـ تان ـ نارد ـ ین |
| دە ـ تان ـ نێر ـ ین | دە ـ مان ـ نارد ـ ن |
| دە ـ یان ـ نێر ـ ن | دە ـ یان ـ نارد ـ ن |

دەستەی (٢) هەمیشە بە رەگی کارەوە ئەلکێ.

..... یاسا (٢)

دەستەی (١) بەپێ ی قالبی رستەکە جێ گۆرکێ ئەکات... بە بچووکترین ژمارەی ئەم بەشانەی رستەوە ئەلکێ:

رستە




..... یاسا (٣)

واتا ئەگەر بەرکاری راستەوخۆ لە رستەکەدا ئامادەبوو ئەم کۆمەڵە راناوە بەمەوە ئەلکێ... ئەگینا بە خاوەن ژمارە (٢)وە ئەلکێ و بەم جۆرە.. لەرستەی ئیمە بۆتۆ ـ مان (٣) نارد (٢)

بەرکاری راستەوخۆ کە ژمارە (١)ە لەم رستەیەدا نی یە.. بۆیە بە بەرکاری ناراستەوخۆوە ئەلکێ چونکە لەم رستەیەدا ئەمیان خاوەن بچوو کترین ژمارەیە...

لە رستەی

من بۆم نارد

(٣) (٥)

راناوی کۆمەڵی (١) بە ژمارە (٣)وە لکا.. چونکە پێشبەند لەم رستەیەدا خاوەن بچووکترین ژمارەیە.

★ ★ ★ ★ ★

بۆ گۆرینی راناوی جودای بەرکاری بە راناوێکی لکاو

١- سەیری کاتی کارەکە ئەکەین.. داهاتوو بێ روو کۆمەڵی یەکەم ئەکەین.. رابردوو بێ لە کۆمەڵی دووەم:

٢- بەپێ ی کەس و ژمارەی راناوە جوداکە، لکاوەکە هەڵئەبژێرین.

٣- بەپێ ی یاساکانی شوێن... شوێنی راناوی لکاو لە رستەکەدا جێگیر ئەکرێ.

لەرستەی

## تۆ ئیمەت بە ئەو نەناساند

بۆ گۆرینی راناوی جودای بەرکاری راستەوخۆ (ئیمە) بە لکاو:

١- کاتی کارەکە رابردووە ـ واتا راناوی لکاوی بەرکاری [بەپێ ی یاسا ژمارە (١)] لە کۆمەڵی (٢)وە وەرئەگیرێ [م ـ یت ـ × ـ ین ـ ن ـ ن].

٢- (ئیمە) کەسی یەکەمی کۆیە.. راناوی لکاوی بەرامبەری لە کۆمەڵی (٢)دا.. (ین)ە.

٣- (ین) جێ ی (ئیمە) ئەگرێ و بە پێ یاسای شوێن ژ(٢). بە رەگی کارەکەوە ئەلکێ لەم حاڵەتەدا (ت) کە راناوی لکاوی بکەری یە وسەر بە کۆمەڵی (١)ە.. بەرەڵلا ئەبێ.. بە پێ ی یاسا(٣) ئەم کۆمەڵە ئەگەر بەرکاری راستەو خۆ نەما بە بەرکاری ناراستەوخۆوە ئەلکێ.. ئەم گۆیزانەوەیە لەم رستەیەدا بەم جۆرە ئەبێ:




تۆ بە ئەو ـ ت نە ناساندین

بۆ گۆرینی راناوی جودای بەرکاری ناراستەوخۆ بە لکاو لەرستەی:




ئیمە بۆ ئەو ـ ت ئەنێرین

★ ★ ★ ★ ★

لە ئەنجامی گۆرینی راناوی جودای دوای پێشبەندی (بە ـ لە) هەندێ گۆرا نکاری لە شێوەو شوێنی ئەم پێشبە ندانە روو ئەدات کە ئەمانەن:

**یەکەم** ـ ئەگەر ئەو ناوە یا راناوە جودایەی دوای پێشبەندی (بە ـ لە) کرا بە لکاو:

بە ئەبێتە پێ

لە ئەبێتە لێ




ئیمە پێمان سپاردیت




تۆ کتێبەکەیان لێ وەرئەگریت

**دووەم:** لە گەل هەندێ کاردا.. ئەگەر ئەو ناوە یا راناوەی دوای پێشبەندی (لە) کرا بە لکاو.. (لە) ئەبێتە (تێ).




ئەو ئاگری تێ بەردایین

**سێ یەم:** لەگەڵ بەشێ لەو کارانەی چەمکی گوێزانەوە ئەگەیەنن وەك [دان ـ گەیشتن ـ لە گرتن.. هتد] ئەگەر ئەو ناوە یاراناوە جودایەی دوای پێشبەندی (بە ـ لە) ئەبن بە پاشبەندو قاڵبی (ێ) ئەگرنە خۆ وبە کۆتایی کارەکەوە ئەلکێ:




ئێمە کتێبەکەت ئەدەیێ




ئەوان بەردیان گرتیێ

من ئەم یاسایەم لەوتاری (پێشبەندەکان)دا بەم جۆرە دارشتوە [لەگەڵ فرمانی (دان ـ گەیشتن.. هتد) ئەگەر ئەو ناوە یا راناوەی ە دوای پێشبەندی (بە) دەرئەکەوێ بە راناوێکی لکاو دەربرا پێشبەند، (بە) ئەبێتە پاشبەندێکی فرمان و قاڵبی (ێ) ئەگرێتە خۆ][8].

ئیستا دێینە سەر بۆچوونەکەی مامۆستا مسعودمحمد و بزانین تاچ رادەیێك تیایا سەرکەوتوو بووە.

مامۆستا مسعود محمد لە ل ٥٥ی (چەند حەشارگەیێکی ڕێزمانی کوردی)دا باسی پاشبەندی (ێ) ئەکات وئەڵێ.. [لەوەدا لە حالی بزر بوونی مفعول بزوێنەکە دەبێتە (ێ)...] تا دێتە ل ٥٦ وئەڵێ [دەرکەوتنی مفعول لە وێنەی راناوی لکاو مەنعی هاتنی (ێ) کە ناکات]

لەگەڵ ڕێزم بۆ مامۆستا مسعود ئەم بۆچوونە دوورە لە راستی لەبەر ئەم هۆیانە

١ - بزوێنەکە نی یە ئەبێتە (ێ) بەڵکو پێشبەندە بە دوو جۆر یاسای گوێزانەوەی جیا جارێ ئەبێتە ( ە)[9]و جارێ ئەبێتە (ێ). و بوونی پێشبەند بە (ێ) پەیوەندی ی بە سیستەمی راناوی لکاوەوە هەیە.. بەڵام بوونی بە ( ە) هیچ پەیوەندی یەکی بە راناوی لکاوەوە نی یە[10]:

ئەو دای بە تۆ

ئەو دایە تۆ

ناردم بۆ سلیمانی

ناردمە سلیمانی

٢ - (کە زۆر گرنگە) بزر بوونی مفعول نی یە ئەیکات بە (ێ) بەڵکو گۆرینیەتی بە لکاو.

وەك لەسەرەوە روون کرایەوە کۆمەڵە راناوی [م ـ یت ـ × ـ ین ـ ت ـ ن ] دەوری بەرکاری لەگەڵ رابردووی تێپەڕا ئەبینێ. لەم کۆمەڵەدا کەسی سێ یەم هیچ قاڵبێکی ئاشکرای نی یە (ئەمەت بیرنەچێ) بۆیە ئەگەر ئەو ناوە یاراناوەی دوای هەچ پێشبەندێ لە کەسی سێ یەمی تاکدا بێ و بکرێ بەلکاو هیچ سیمایێکی بۆ دەرناکەوێ.




ئێمەدامانێ

نموونەکەی مامۆستا مسعود محمد لەم جۆرەیە




بەردم گرتێ

بۆ زیاتر روون کردنەوەی ئەم لایەنە، سەیری هەموو احتمالەکان بکە (بە پێ ی نموونەکەی مامۆستا مسعود محمد)

| | | |
|---|---|---|
| | من | م |
| | تۆ | یت |
| بەردی گرت . . ـە | ئەو (چوێلەکەکە) ← | گرت ـ یٚ |
| | ئێمە | ین |
| | ئێوە | ن |
| | ئەوان | ن |

لە داهاتوودا دەوری راناوەکان ئاڵ و گۆڕ ئەبێ و کۆمەڵی (م ـ ت ـ ی ـ مان ـ تان ـ یان) دەوری بەرکاری ئەبینن. لەم کۆمەڵەدا راناوی لکاوی کەسی
سێ یەمی تاك قاڵبی ئاشکرای هەیە (ی)




واتا نموونەکەی مامۆستا مسعود محمد بکرێ بە داهاتوو راناوە لکاوەکە ئەبێ دەرکەوێ ئەگینا رستەکە لە رێزمانێتی ئەکەوێ

(بەرد دەگرێێ) رستەیەکی نارێزمانی یە
ئەمە بەڵگەی ئەوەیە کە راناوی لکاو لەم جۆرە رستانە ئەبێ دەرکەوێ
**obligatory**

نموونەکەی مامۆستا مسعود محمد بکرێ بە کۆ.. هەموو شت ئاشکرا ئەبێ.




لەبەر ئەوەی مامۆستا مسعود محمد رستەی (بەردم گرتە چوێلەکەکە)ی کردۆتە بەڵگە بۆ بۆ چوونەکەی
بۆیە وای بۆ چووە کە بزر بوونی مفعولە (لە)ئەکا بە (یٚ)

بەداخەوە ئەڵێم د. ئاورەحمان لەم بۆچوون و بریارەیدا نەختێ پەلەی کردووەو بۆچوونەکەی مامۆستا مسعود محمدی بە راستی یەکی مطلق لەقەڵەم داوەو بریاری ئەوەی داوە من لەوم وەرگرتووە. . ئەمە دژی

هەموو جۆرە پێرەویکی زانستی یە.

## سەرچاوەو پەراوێز

١ ـ لەژمارە ١٤٠ی ساڵی ١٩٩٧ی گۆڤاری رۆشنبیری نوی دا بە ناوی (رەخنەی نارەخنە)وە هەندێ تێبینیم لەبارەی وتاریکی د. ئاورەحانەوە کە لەبارەی پاسیکمەوە بوو خستبووە روو. د. ئاورەحان بە پاسێکی دوور و درێژ بەناوی (رەخنەی نارەخنە)وە وڵامی داوەتەوە..

٢ ـ مسعود محمد (١٩٧٦) چەند حەشار گەیکی رێزمانی کوردی.. بەغداد.

٣ ـ وریا عمر امین (١٩٨٦) پاشبەندەکان ـ گۆڤاری کۆڕی زانیاری ی عیراق ـ دەستەی کورد بەرگی ١٥

4 - Edmonds , C.J (1955), Prepositions and Personal affixes in southren Kurdish BSOAS xv11 490

5 - Mackenzie, D. N. (1961) 'Kurdish dialect studies V.I - London.

٦ ـ کرمانجی ی خواروو

٧ ـ بۆ (یت ات) سەیری ئەم باسەم بکە وریا عمر امین (١٩٩٨) راناوی کەسی سێ یەمی تاك ـ رۆژنامەی هاوکاری ژ ٢٨٦١ رۆژی ١٩٩٨-٣-٨.

٨ ـ پەراوێز ژ (٣) ل

٩ ـ د. ئاورەحان لە رەخنەکەیا لە بارەی پاشبەندی (ـە)وە ئەڵێ (مامۆستا مسعود محمد لە کۆتایی ل ٥٤دا ئەوەی یاداشت کردووە کە بەشێك لە کردارەکان هەڵناگرن (ـە) یان بگۆڕێ بە پێشبەند، هەرچی د. وریاشە ئەو دەربڕینەی پاش وپێش کردووە)

من بەپێ ی پێرەوی گوێزانەوەی چۆمسکی سەیری زمان ئەکەم و لایەنەکانی زمانی کوردی شی ئەکەمەوە.. ئەم پێرەوە دوو ئاست جیا ئەکاتەوە (بنج) deep structure و(سیما) Surface structure دەستەیێك یاسای گوێزانەوە Transformational rules بنجەکە ئەگوێزنە سیما.. پێشبەند سەر بەبنجە (ـە) سەر بە سیمایە.. واتا پێشبەندە پاشبەندی لێ وەرئەگیرێ.. راکەی مامۆستا مسعود محمد پێچەوانەی ئەو پێوانەیە من کاری پێ ئەکەم.. ئەوەی لە قوتابخانەی چۆمسکی نەگات ناتوانێ رەخنە لەباسێ بگرێ، بەپێ ی ئەم پێرەوە نوسراێ

١٠ ـ Pronominolization راناواندن.. لە پێرەوی چۆمسکیدا جێگیرکردنی راناو لەجێ ی ناوێ یافرێزیکی ناوی.

Cliticization جێگیرکردنی راناویکی لکاوە لەجێ ی جودا.

بۆ ئەمانە سەیری ئەم سەرچاوەیە بکە

Waria Omar Amin (1979) Aspects of the verbal Constraction in Kurdish - London University.

دەست نیشان کردنی یاساکانی پاشبەندی (یَ) لە زمانی کوردیدا بابەتێکی ئاڵۆزی سەر بە سینتاکسە. ئەوە چەن ساڵە (وەك سەرۆکی بەشی کوردی) داوا لە د. ئاورەحان ئەکەم دەرسی سینتاکس بە قوتابی یانی ماجستێر و دکتورا بڵێتەوە.. داوای لێ بووردن ئەکات و ئەڵێ لێ ی نازانم و سەرم لێ ی دەرناچێ.. کەچی لێرە خۆی لەم گێژاوە داوە..

خاڵێکی تر لە رەخنەکەی د. ئاورەحاندا کە پەیوەندی ی بە مامۆستا مسعود محمدەوە هەیە ئەوەیە ئەڵێ گوایا من لە وتاری (رەخنەی نارەخنە)دا قسەی ناشیرینم بە مامۆستا مسعود محمد وتووە..

ئەو گۆڤارەی کە ئەم وتارەی تیا بڵاوکراوەتە هێشتا مەرەکەبەکەی وشك نەبۆتەوە.. یا خوێنەری بەرێز سەیریکی بکات و بزانێ چی یە.

ئەوەندەی من لەم وتارەدا باسی مامۆستا مسعود محمد ئەکەم ناوی ئەهێنم هەر ئەوەیە ئەڵێم [باسەکەی من بە ناوو ناوەرۆکەوە لە بارەی دەنگە سازی یەوەیەو باسەکەی مامۆستا مسعود محمد شتێکی ترەوبە هیچ جۆر خۆی لە دەنگە سازی نادات] لەمە زیاتر هیچ ناڵێم و بە هیچ جۆر ناوی ناهێنمەوە.

لە کۆتایی وتارەکەدا.. وەك ئەنجامێك ئەوە دەرئەخەم کە [لەم باسەدا یاسایکی دەنگی ی زمانی کوردی دەست نیشان ئەکەم و وەك من بزانم دۆزینەوەی خۆمەو پێشتر باس نەکراوەو بە شێوازیکی زانستی دوور لە سەلەفی یەتی درێژدادڕی بێ سوود ئەنجام پێشکەش کراوە.. ئەبوو د. ئاورەحان واقیعی بوایەو ئەمەی دەربخستایە] لێرە من وەسفی وتارەکەم ئەکەم.. ئەمەچ پەیوەندی یەکی بە مامۆستا مسعودەوە هەیەو چی مامۆستا مسعودی هێنایە سەر ئەمە.

ئەگەر د. ئاورەحان وای گەیشتێ کە مەبەسم کەسێك بووبێ (کەوا نی یە) ئەوە ئەو کەسە هەر خۆی ئەگرێتەوە چونکە من وەڵامی ئەو ئەدەمەوە مامۆستا مسعود محمد بە هیچ جۆر تەرەف نی یە.

ئەوەی مایەی دڵخۆشی یە ئەوەیە د. ئاورەحان دوای ئەمە هەموو دان بەوەدا ئەنێ کە باسەکەی من و مامۆستا مسعود دوو بابەتی جیاوازن و ئەمجارە لە بارەیە ئەڵێ [ئەگەر بیوتایە تەنیا لە سلیمانی و چەن ناوچەیەکی کەمی دی ئەم دیاردەیە دەبینرێ ئەوە رەخنەی نەدەهاتە سەر] (ل٣) ئەی بۆ هاتە سەرم و لە سەر چی بوو هاتە سەرم و بوو بە چی[11].

(١١) د. ئاورەحان چەن جارێ لە بەردەم مامۆستاو قوتابی یانی خوێندنی باڵا ئەوەی دووبارە ئەکردەوە کە نامەکانی ماجستێر و دکتوراە هەموو (وریانامە)ن چونکە زۆربەی زۆری سەرچاوەکانیان وتاروباس ولێکۆڵینەوەکانی منن.. کە چی لەم رەخنەیەیدا ئەمەی سەرەوژێر کردۆتەوەو وای دەرخستووە کە (سەرچاوەکان لە نامەکان

وەرگیراون).

ئەو شتانەی د. ئاورەحمان ئەڵێ من لەو نامانەم وەرگرتووە گەر دووبارە سەیریکیان بکاتەوەو چاوێ بە سەرچاوەکانیان بخشێنێ.. بۆی دەرئەکەوێ کە بە پێچەوانەوەیە.. هەموو ئەوان لە منیان وەرگرتووەو. ئەوە گەزو ئەو جاوو تاکە نموونەیێک ئەخەمە بەرچاو..

یەکێ لە سەرچاوەکانی نامەی ماجستێری ماموستا فتاح مامە عەلی


بۆ ماموستای گەورەم بەڕێزم دکتۆر ئاورەحمانی حاجی مارف
سڵاوێکی برایانەو زانستی پاکتان لێ بێت
برای بەڕێز لەم دوایییەدا وتارێکتان بەناوی (ڕەخنەی ئارەستنووس بڵاوکردۆتەوە کە تیایدا هێرشێکی زۆر ئەکەنە سەر
د. وریا عومەر ئەمین، یەکێ لەوانەی کە پەیوەندی بە منەوە هەیە
پێویستە ئەزانم ئەم ڕوونکردنەوەیەتان پێ ڕابگەیێنم :
لە وتارەکەتاندا واتان لەقەڵەم داوە کە د. وریا هەموو زار
وەک (لێڵی و هاوەدەنگ و (پێم دەخوری) ی لە نامەکەی من
کە بە ناوی (هاوەدەنگ لە زمانی کوردیدا) یە وەرگرتووە
ئامە وە لە سەرچاوە ناهێنێ.
برای گەورەو بەڕێزم : ئەوەی ڕاستی بێ ئەوەیە کە د. وریا
کە بەناوی (پێنج و سیماو یاساکانی گوێزانەوەیە و لە ژمارە (١٢١
نوێ بڵاوکردۆتەوە، ئەم
هەڵ سەرچاوە سوودم لێ بینیوە و لە لاپەڕە (٧٤) ئاماژەم
لیستی سەرچاوەکانیشا دووجار ناوی وتاری ناوبراوم هێناوە
ڕاستی و ڕێزگرتن لە زانست و مەوزوعیەت ئەم ڕوونکردنەوە
وانە پێشکەشم کە فەرد بۆ کاک د. وریا.
لەگەڵ ئەوپەڕی ڕێزم و هیوای سەرکەوتن بۆ هەموو دڵسۆزێک
برای چووکتان
فتاح مامەعەلی
١٩٩٨/٧/٢٢

هاوەدەنگ لە زمانی کوردیدا باسێکی منە کە بە ناوی (پنج و سیماو یاساکانی گوێزانەوە)یە. لە ژمارە ١٢١ی گۆڤاری رۆشنبیری بلاوکراوەتەوە.. تیایا من باسی (لێڵی)ئەکەم و هەندێ رستەی لێڵی وەك (پێم دەخورێ) ئەهێنمەوەو شی یان ئەکەمەوە (ل٧٤).

ماموستا فتاح مامەعەلی زاراوەی (لێڵی)و ئەم رستەیەی لەم باسەی من وەرگرتووەو لە پەراوێزدا ئیشارەتی بۆ کردووە (ل ٢٤ی نامەکە) دوای ئەمە من ئەم زاراوەو ئەم رستەیەم بۆ ساغ کردنەوەی هەندێ لایەنی تری زمانی کوردی بەکارهێناوە ئەوە لە وتارێکا بە ناوی (لێڵی لە زمانی کوردیدا). لە هەموو شت سەیرتر ئەوەیە د. ئاورەحمان ئەم وەرگرتنەی سەرەوە ژێر پێنووسەوەوای لە قەڵەم داوە کە من لە ماموستا فتاح مامە عەلیم وەرگرتووە.

کاك فتاح مامە عەلی نامەیەکی لە بارەی ئەمەوە بۆ د. ئاورەحمانی حاجی مارف ناردووە ئەم شتانەی تیا روون ئەکاتەوەو دانەیەکی لێ بۆ ئێمە ناردووە.. دەقی نامەکە بە دەس خەتی خۆی بلاو ئەکەینەوە.. و هەر ئەوەندە لە بارەیەوە ئە ڵێین (هەموو تاریکی جیهان ناتوانێ کزترین مۆم بشارێتەوە)..

## ملخص البحث

# اللاحقة |ێ|


د. وريا عمر امين
استاذ علم اللغة ـ جامعة بغداد



يرتبط ظهور اللاحقة (ێ) بقواعد ونظام الضمير المتصل في اللغة الكردية.

هناك مجموعتان من الضمائر المتصلة في اللغة الكردية:

١ـ [م ـ ت ـ ی ـ مان ـ تان ـ یان].

٢ـ [م ـ یت ـ Ø، ات یت ـ ین ـ ن ـ ن

المجموعتان تلعبان الدور الفاعلي والمفعولي بالتعاكس نسبة الى زمن الفعل. فعند ظهور احد المجموعتين للدور الفاعلي تظهر المجموعة الاخرى للدور المفعولي وكما موضع في هذه الصورة.

فاعل ـ (١) ـ مفعول

ماضي مضارع

مفعول ـ (٢) فاعل

عند تحويل ضمير المفعول به الغير مباشر المنفصل الى متصل فحروف الجر (له) و(به) قد يتحولان الى اللاحقة الفعلية (ێ).

هذا ما يحاول الباحث تفسيره وتحديد قواعده ونظامه وفق النهج التحويلي ويبين بانه ليس بمقدور المدرسة التقليدية تفسير هذه الظاهرة وتحديد قواعدها

# ژ هزرا ئابۆریا ئیسلامی

شێخ یاسین رشید زێباری



ئیسلامەتی ئەیدولوجیەکا ئابوری یا تەمازە هەلدگریت. ئومێد ژ ڤێ ئەیدولوجیێ ئەوە: کوما وا بیرو باوەرا وا بنگەها ئەوێت رێبازا ئیسلامیتێ لسەر دچیت بو ئابوریا بەشەری و وابنگەها ڤەگوهێزتە کاخا کار پێکرنێ. کومەلێ برەنگەکێ ئاشکرا بکاربینیت. ئەیدیولوجیا ئابوري یا ئیسلامی رادبیت لسەر سێ ستوینا. ئەڤ ستوینە ئەون تەرخاندکەن راوەستانا ئیسلامەتیێ بەرامبەری رێچوو رێکوپێکیێت نشتیمانی بێت دی. ئەوێت نەشیاین ئومێدو هیڤیێت مللەتا بجهبینن و هاتیە هەرفاندن ددەمەکێ کورت دا وەکێ رێچویا - ئیشتراکی و رەئسومالی - ئەڤێت گەلەکا چەپلە بو قوتاین د چەرخێ بیستێ دا. جارەکادی ئیسلامەتی هاتەفکاخێ و سەرێ خو بلندکرەڤە پ پرمەرداتی و شانازی. یا ئاخفتنامە پ بنگەهی دئینیت ئەو رێبازا زانکوێت جیهانێ گرتی کو برەنگەکێ تایبەتی ئابوریا ئیسلامەتی بخوینن تەخاسمە ل عیراقێ ل زانکویا بەغداو - مستنصریە - و بێت دەی گەلەك نامێت ماجستێر و دوکتورایێ هاتنە چێکرن لسەر ئابوریا ئیسلامی و هند دزورن ئەم نەشێین نائێت هەمال بیێژین لڤێرەدا. دێ هێنەڤ سەر ئاخفتنا خو ستوینێت ئابوریا ئیسلامەتیێ سێنە:

١- گرێدان دمابەینا مەسلەحەتا پارەیی و هێسانایی (روحی).

٢- گرێدان ل نێوان بەرژەوەندیا گشتی و تەخاسمە (تایبەتی).

٣- کومکرن دمابەینا نەگورینێ و گورینێ.[1]

## خر ڤەکرنا بەرژەوەندیا پارەیی و هێسانایی (روحی)

د رێبازێت چاخەیی دا خەباتا بەشەری یا ئابوری رەوشەکێ پارەیی یێ گشتی دنالدایێ هەی. بەلێ دئیسلامەتیێدا ئەڤ خەباتە یا ئابوری دبنگەهێ وی یێ فایدەییە بەلێ یێ ئامداییە پ هێسانایێڤەو روحی ڤە کو مروڤێ بوسولمان بنیاتێ کارێ وی لسەر هزرا هەبوینا خودێ یەو هیڤیاوی دکارێ وی دا خرێ رازیبوینا خودێ بەو یێ دحەسیێت ئەو خرکارا لگەل بەنیا ناکەت بەلێ وی لگەل خودێ یە. رێکوپێك دبیت لسەرڤێ بنگەهەی گەلەك شوینەوار ژ وا:-

١- ئاما خودێ ئاسیێ و روحی یا دناڤ چالاکیاویدا. چالاکیا کەسانی دئیسلامەتییدا د رەخ باوەریاوی بکارێ فایدەیی بکارێ فایدەیی ئەو باوەر دکەت برەخێ خودێ نا سینێڤە تەڤەژی بجهئینانا ڤێ ئایەتیە: (ولاتکونوا کالذین نسوا الله فانساهم انفسهم)[2] هنگە وەکی وانەبن ئەوێت خودێ ژ بیرکری تا خودێ وەلێکرن نەفساخو ژبیرکەن. پێغەمبەر سلاڤێت خودێ لسەربن دبێژیت: (إن الله عز وجل لا يقبل من العمل الا ما كان خالصاً وابتغى به وجه الله) أخرجه أبو داود والنسائي.[3]

خودێ تەعالا وەرناگریت ژ کارا ئەو بیت یێ پاك و دریکا خودێ دابیت. ئەڤ ئاخفتنە ژ دەرهێنانا: أبو داود والنسائي یە.

ئیسلامەتی ژێکڤەناکەت فایدێ دونیایێ و دوعاهیێ. لەوا هەر کارەك بوسولمان پێرابیت پەرستنا خودێ یەمادەم یێ درستبیت و حەلال بیت.

یێ هاتیە ڤەگێران سەحابیێت پێغەمبەری سلاڤێت خودێ لسەربن گەنجەکێ بهێزو قووەت دیت یێ بلەز و بەزە دچیتە سەر کارێ خوە هندەکا ژوا گووت:

خوزی خەباتا ڤی گەنجەی دریکا خودێدابا.. قاسدێ خودێ ئاخفتناوا ڤەگێراڤە و گووت ی (لا تقولوا هذا فانه إن كان خرج يسعى على ولده صغاراً فهو في سبيل الله).

وەنەبێژن: هەکە ئەڤ زەلامە دەرکەڤتبیت دا خزمەتا بچویکێت خوێت سافلبکەت کارێ وی د رێکا خودێدایە.

(وإن كان خرج يسعى على ابوين شيخين كبيرين فهو في سبيل الله).

هەکە ئەو گەنج دەرکەڤتبیت ژ مالاخو دا خزمەتا دایبابێت خو یێت مەزنو پیر ئەو دریکا خودێدادچیت. ئەڤە پەروەردیەکە ئیسلامەتی نیشا گەنجا ددەت کو ئەو خو بدەنە شولی و کاری دەمێ دایبابێت وا پیردبن و مەزن دبن. چنکو دایبابا گەلەك زەحمەت و شەڤەسەریا بری تا بچویکێت خو مەزنکرینە لەوا ئەو هەژی هندێنە پشکەك ژ وەفادارییێ بو بزڤریتەڤە. دژیاناوادا نەخو ئەم دزانین کێم زوریەتا هەی دایبابێت وا

بێنەبیرێ پشتی مرناوا کو خێرەکێ بو بکەن یان ئێکی فرێکەنەحەجێ بەدەل وی هەکە نەچوبیتە حەجێ.

سەد مخابن بۆواگەنجا ئەوێت دایابێت خو ددەنە شۆل وکارێت گران و ئەو زەندو باسکێت خو رویتدکەن و دکولانا دگەرێن. یان کارێ وا نڤستنەو تەناهیە ئو دەمێ رادبنەڤە پارە دڤێن ژ دایابێت خو دا بچنە جهێت حەرام و گونەح لێ بێنە کرن. نەخاسمە گەلەك ژ خەلکێ گوندا بوی رەنکی نەو بەرێخو ددەنە دایابێت خو برەنگێ خزمەتکاریێ و خولامەتینیێ. پیرەمێرو پیرەژن رۆژێ خرێ د قەتینن دناڤ زەڤیێدا ئو کورێت وا هایژێ نینە.

دەمێ ئەم بچویك بیرامن تێتەڤە مرۆڤەك هەبی ل گوندی شەڤ و رۆژێت خو دەقەتاندن لسەر بێدەرێ بتونێ بێی کو کورو برایێت وی هاریکەن لەوا گۆتە خەلکێ مالاخو: هەر ل دەڤ من راوەستن بلا شۆلنەکەن دا خەلك نەبێژیت: ئەڤەیێ مالۆیرانە کەسێ خۆ نییە....؟

(وان کان خرج یسعی علی نفسە یعفها فهو في سبیل الله).

هەکە ئەو دەرکەفتبیت بۆکارەکێ دا گیانێ خو بپارێزیت ژ کارێت خراب ئەو یێ درێکا خودێداو پەرستنا خودێ دکەت.

(وان کان خرج مفاخرة فهو في سبیل الشیطان).[3]

ئەمما هەکە ئەو دەرکەفتبیت دا خو نیشا خەلکی بدەت و دا خەلك بەحس ژێ بکەت کو یێ بهێزە مەردە خودان زەلامە، ئەو کارێ وی درێکا شەیتانیدایە.

٢- جیاوازیا لێپرسینێ: دبن سێبەرا رێبازا دانایی لێپرسین لسەر بنیاتێ قانونیێ یە. هەکە کەس نەبینیت ئەڤە دەربازبوی کیش کارێ کربیت.

بەلێ لبن سێبەرا شریعەتێ ئیسلامەتیێ دا لروخ لێپرسینا شریعەتێ بەر پسیاریا ناڤخۆیی یاهەی بنگەهێ وێ باوەری یە بخودێ و رۆژا دویماهیێ. مرۆڤێ بوسولمان فێلکەریێ ناکەت دهەمی کارێت خۆدا کیش جهێ لێبیت لەوا بەرهەم دێ زێدەبیت مال دێ هێتەپاراستن. ئابوری دێ بهێزکەڤیت.

ئەڤ باوەریا بوسولمانێ ستویناوێ ئاخفتنا پێغەمبەریە سلاڤێت خودێ لسەربن:

(أعبد الله كأنك تراه فان لم تكن تراه فانه يراك)[5]

تو پەرستنا خودێ بکە هەروەکی تو خودێ دبینی هەکە تو نەبینی ئەو تە دبینیت.

٣- ئامانج و خەباتا بەشەری چالاکیاوی د هەمی رێبازێت ئابۆریدا مەسلەحەتا پارەییەو فایدەیەو بەرفرەهیا ئابۆریە. ئەمما د ئیسلامەتیێدا ئامانجا قازانجی یێکە ژ ئۆمێدا نەهەمی یە چنکو مال پێسترکە بۆبجهئینانا خۆشیێ بۆبەشەری نە ئامانجە د ژیانا بوسولمانیدا. ددیتنا ئیسلامەتیێدا: مرۆڤ جێگرێ خودێ یە لسەر رویێ زەمینێ ژوی خاستیە هەردەم ببیتە جهێ ڤی کارەی و ئاڤاکەت عەردی ساخکەتەڤەو ژیانێ پەیداکەت بۆ بەنیێت خودێ پ چاندنێ و بازرگانیێ و رێکێت دی

خودێ تەعالا یێ گۆتی: (إني جاعل في الأرض خليفة)[6] من یێ دانای جێگرێ خۆ لسەر عەردی. نیشانە بۆ بەشەری.

پێغەمبەر سلاڤێت خودێ لسربن یێ گۆتی: (الدنیا حلوە خضرة وان الله مستخلفکم فیها وناظر کیف تعملون)[7] دونیا یا شرین و تەرە خودێ هنگە یێت کرینە جێگرو وەکیل دێ بەرێخو دەتە وە کادێ پ چ کاررابن. ئەڤە نیشانە کو خودێ ئاڤاکرن و خەبات ژ بەنیێت خوە دڤێت ئو ئەو رێکەکە ژ پەرستنێ بو خودێ.

## کومکرن دمابەینا بەرژەوەندیا نەمازە و گشتی

ئیسلامەتیێ بتونێ سیاسەتەکا نەمازە یاهەی یا هەلبژارتی پالنادەتەڤ سەر کەتە مرۆڤا وەکی د یێچۆیا کەتایەتی د ـ رأسمالیێدا ـ ئو نەپالێخو ددەتەڤ سەر کۆمەلێ بتونێ وەکی بیردۆزا شیوعی.

سیاسەتا ئیسلامەتیێ راودوەستیت لسەر بەرامبەرینیێ و کێشانێ د مابەینا مرۆڤێت کەت و بەرژەوەندیا کۆمەلێ ئەوئیدیەما دبێژنێ ـ الوسطیة ـ ناوەندی. خودێ یێ گۆتی: (وکذلك جعلناکم امة وسطا)[8] هەر بوی رەنگی مەهنگە یێت کرینە مللەتەکێ ناوەندی. نیڤەکی لڤێرە نەرماتیە نەنیڤەکیا حسێبێیە. نەرماتی ناهێتە دانان برەوشتەکێ هەنبژارتی و راوەستایە بەلێ فەرمانبەرەکە لدویف دەمی گۆرینا هەی و لدوی جهی و ڤەگرتنا وەکی جەنگاو رەخگرتنێ (حصار گەمارۆ) بەلکو گەلەك جارا لایێ بەرژەوەندیا گشتی بگریت تا هندەك دەما بەرژەوەندیا نەمازە بکەینە قوربانی. ئەڤ بنگەهە تێتە پاراستن دڤان خالێت خارێدا:

١- بەرژەوەندی یا گرێدایە بشریعەتێ ئیسلامەتیڤە. رێبازا ئیسلامەتیێ ئامانجاوێ چاکیە. هەمی کار گرێداینە ببەرژەوەندیێ و ئۆمێداڤە ژ وا:

ڤەگرتنا سووداو دویر ئێخستنا خرابیا. بجهئینانا بەرژەوەندیا د ئیسلامەتیێدا نەیا راوەستاییە بەلێ تێتە گۆرین لدوی چاخ و جها ئو نە برەنگەکێ یێك بەلێ لدوی کارێ فەر تر بۆ مللەتێ هەمیێ برەنگەکێ گشتی.

ئیسلامەتی کارێ فەرتر (ضروری) پێشتێخیت ژ یێ فەر یێ هەکە هەبیت باشە هەکە نەبیت ژیان پێ راناوەستیت. ئاشکرادبیت موحتاجێت خەلکی هەمی نەوەکی ئێکن.

٢- ئیسلامەتی بەرژەوەندیا گشتی و کەتایەتی پێکتینیت.

ئیسلامەتیێ سیاسەتەکا هەی یابتونێ یە تێدا یا جیاوازە ژ هەمی رێبازێت دی نە پالێخو ددەتەڤ مرۆڤێت کەت وەکی ـ رأسمالي ـ ی ئۆ نە خو رادگریت لسەر کومەلێ وەکی کومەلێت ـ شیوعی ـ ئیسلامەتی هات رێکەکێ بگریت د مابەینا هەردوکادا بەرژەوەندیا هەردوکا بگریت دیێك دەمدا لسەر بنگەهێ یێك یێدە تمامدکەت. خودێ تەعالا دبێژیت: (لا تَظْلِمون ولا تُظْلَمون)[9] نە هنگە زولمێ لکەسێ بکەن و نەکەس زولمێ لوەبکەت. پێغەمبەر سلاڤێت خودێ لسەربن دبێژیت: (لا ضرر وضرار)[10] نەزەرەر تەبکەڤیت و نە تو خرابیێ لکەسێ بکە.

هەروەکی هاتیە گۆتن لسەر هاتیادریژ:

دەمێ هندەك کەس لسەفینێ سوياربین تەبەقایێکێ و دویێ ئێکی ژ تەبەقاین گووت: ئەز نەشێم بچمە سەر ڤە ئاڤێ بینم لرەخێ خو دێ گەمیێ بکونکەم و ئاڤ دێ بۆمن هێت. هەکە خەلکێ گەمیێ هێلا ڤی کاری بکەت هەمی دێ خەندقن بەلێ هەکە وادەستێ وی گرت بهارۆکاربین لگەلێك هەمی دێ خلاسبن و بتەناهی بن. لگەل ڤێ چەندێ پاراستنا بەرژەوەندیا گشتی.

٣- پێشێخستنا مەسلەحەتا کومەلێ لسەر بەرژەوەندیا نەمازە هەکە بزەحەتکەڤت پێکهاتنا هەردوکا لگەلێك، نەخاسمە ددەمێت راوەستایدا وەکی: جەنگا کولیێ. برسیێ. ئیسلامەتێ بئاخفتنا هەمی زانا مەسلەحەتا کەتا دکەتە قوربانی و پێشێخیت بەرژەوەندیا گشتی کو ئەو مافەکە ژ مافێت خودێ. ئەڤەیە لسەر بنیاتێ شریعەتێ: بێنفرەکرن لسەر زیانا بچویك دا زیانا مەزن دەربازبیت. هەروەکی بریاریت ئیسلامەتێ دای دەمێ پێغەمبەری و راشدیا ژ ڤەگرتنا مولکییەتا کەتا بۆمەزنکرنا مزگەفتا. ئۆبریارا ـ عمر بن الخطاب خودێ ژێ رازیبیت: دەمێ نرخ دانایەر سەرتشتا. ئۆ دەمێ ـ پارەو کەلوپەلێ هندەك کاربدەستێت خو بۆ ـ بیت المال ـ موسادرەکری دەمێ دیتی دەولەمەندیاوا یاژ سنورا چویە دەرێ. نەڤێ دوهی نانەك نەبوی بخۆت ئەڤرو قەسرا ئاڤادکەت ئۆتور ومیلادکریت. إبن حزم دبێژیت: هەکە یێك مر ژبرسا ل جهەکی خەلکێ جهی خوینا وی پێتڤیەبدەن چنکو ئەون سەبەبا کوشتنێ[11]

## گرێدان دمابەینا راوەستانێ و گۆرینێ

دەق و ئاخفتنێت قورئانێ و حەدیسێ دباوەریێ و پەرستنێ و رەوشتێ جهێ راوەستانێنە. نەجهێ هزرکرنێنە جیاوازیێنە. ئەمما ئەو دەقێت هاتین د قورئانێ و سونەتێدا بنگەهێ ریڤەبەریا کۆمەلێ ئەو ستوینێت گشتێنە ئەو بنگەهێت پەرستگاهینە نەجهێ ژێکڤەبوینێ نە هەر کومەلەکائیسلامی دێ پ جهێنیت وەکی ڤەگرتنا هەمی دەرامەتێت بێنە دەست کار بجهێنان بئخافتنا خودێ (فآنتشروا في الأرض وابتغوا من فضل الله)[12] بەلاڤە بین ل عەردی و بپرسن ل رحمەتا خودێ. کو شولکەن و بخەبتن بۆژ یاناخو هەروەها بنگەهێ ڤەگرتنا رەنگەکێ ژیانا بریك و نەڤەژی پێك بکارئینانە ئاخفتنا خودێ (وفي أموالهم حق معلوم للسائل والمحروم)[13] دناڤ مالێ وادا یێ هەی پشکەکا ئاشکرا بۆ دەرۆزکەراو بێبارا. بەلێ کا پ چ رەنگە ئەڤ ستوینە دێ بجههێن ئەڤە یا درست زانا لسەر باخڤن و قەسێت جیاوازبین لدوی دەما و جها هەر وەکی زکاتا ـ فترا ـ هەر وەختەکی و هەر جهەکی رەوشێ خۆ یێ هەی هەردەم کا چ یێ باشە بۆفەقیرا. ئۆ بارا کو فەقیر موحتاجیاوی یێ تێتە قەتاندن. وەکی ڤا پسیارا هەمی ددانایە بۆ ئاخفتنێ و لیڤەکۆلینێ کو کەت و کۆمەل پێرابین. ئاشکراکرنا رەنگێ گرێدانا ئیسلامەتێ راوستان و گۆرین ڤا خالا دێ پارێزین:ـ

١- رێبازا ئیسلامەتێ پەرستگاهیە ستوینێت وێ لیڤەکۆلینە بجهێناناوێ. ستوینێت ئیسلامەتێ چ د ئابۆرین. کۆمەلین سەرۆکانیاوا ـ قورئان و سونەتن. پشتی هنگی کار دخازیت هزرکرن د جهێنانێدا.

بجهێنانێت ئیسلامەتێ یێت دانایینە بەلێ بناغاوال یا راوەستاییە ئەوە کو ژ خودێ اێ و پێغەمبەری لەوا کارێ هزرڤانی و (موجتە هدی) ئەوە چەوا دێ بجهێنیت نەشنوی دێ دانیت. دەمێ ژیانا هەر رێبازەکێ ئاشکرادبیت د جهێنانێدا ئیسلامەتێ گازیکر دا خەللك هۆشێ خو بجهبینیت ژبەر ڤی کارێ پیرۆز مروڤێ زانا و موجتە هد هەکە فەتوە دا پشتی لیڤەکۆلینەکا کویر هەکە ئاخفتنا وی یا راستبوی ذوو خیرێت هەین. هەکە یا خەلەتبوو خێرەکا بتونێ یا هەی بەلێ ئیسلامەتێ ژ ویڤەتر چوو دەرکێ ئنجتیهادێ و لیڤەکۆلینێ کرە ژێدرێ سێێ د دەرئێخستنا خوکمێت شەرعیدا.

٢- بنگەهێت پەرستگاهی ددرستن و د ووجن بۆ هەمی چاخا و جها ئەڤەژی نیشانێ هندێ یە ئیسلامەتێ چ قەید نەدانایە لسەر هۆشێ بەشەری ئەڤە ئاشکرادبیت دڤا هەردو کارادا:ـ

أ- بنگەها پەرستگاهی د ئیسلامەتێدا ئەوێت پویتەی تێکیەلینیا دکەن د کێمن و د ژمارتینە بەرامبەری ئەڤێت دی ئۆ پترین ژوا رەنگەکێ گشتی یێ هەی بێ کو مایێ خۆ د بەرفرەهیا دابکەت. وەکی زکاتێ خودێ یێ گۆتی بدەن بەلێ کا چەندە و پشکاکیە ئەڤە کارێ زانایە پێ رابین.

ب ـ ئەڤ ستوینێت یاسایی یێت گشتی مایێ خو د پێتڤییێت فەر دکەن بۆ هەر کەسەکی و هەر مللەتەکی بێ تێبینی ژ جهێ پێشکەفتنا وی مللەتی ئۆ جهێ ئەو ستوین لێ بکاربهێن. لدویماهیێ کارێت دی جهێ ئاخفتنێ نە.

٣- ئاشکراییێت بجهێنانا شریعەتێ تێنەگۆرین ب گۆرینا دەم و جها. رەنگەکێ تایبەتێ نی یە. بەلێ هەر کۆمەلەکێ بجهێنا نەکا هەی لدویڤ ژیانا ئەو تێدا دژیت لەوا دەرگەهێ ئیجتیهادێ یێ ڤەکریە.

## ڤەگرتیێت بکارئینانا هەبوینێ

د ئیسلامەتێدا هەکە یێکی تشتەك هەبیت نابیت برەنگێ ئەو حەزکەت بکاربینیت بهەجەتا ئەڤە مولکێ منە ئەزێ سەربەستم بکارئینانا وی دا. ئیسلامەتێ رێبازەکا بۆ دانای و ڤەگرتیێت بۆ داناین پێتڤیە لدوی بچیت ژ ڤا ڤەگرتیا:ـ

١- پارەو مال نەهێتە نڤاندن بەلێ هەردەم بکاربهێت. گەلەك دەقێت ئیسلامی داخازن بۆ ڤی کارەی ژ وا خودێ دبێژیت: (والذين يكنزون الذهب والفضة ولا ينفقونها في سبيل الله فبشرهم بعذاب أليم)[14] ئەو کەسێت زێرو زیڤا خرڤەدکەن و هەلدگرن ئۆ ئەو ناکەنە خێر د رێکا خودێدا تۆ مزگینیێ بدەیێ ب ئێشەکا گران. هندەك زانا یێ گۆتی د تەفسیرا ڤێ ئایەتێدا: ئەو کەسێ زکاتێ ژ مالێ خوە بدەت نابیتە خرڤەکەر

و لبەرڤی ئایەتێ ناکەڤیت.[15]

بەلێ د هندەك حەدیسادا یێ هاتیە گۆتن: (مَنْ ولي يتيماً له مال فليتّجر له ولا يتركه حتى تأكله الصدقه)[16] ئەو کەسێ هێتیمەك ددەستیدابیت و مال هەبیت بلا بازرگانیێ بۆبکەت دا زکات نەخوت و خلاس نەکەت.

دەمێ مالێ خو ددەتە شوولێ ژی نابیت ب فائیزو ریبا بدەتە شوولی. بەلێ پ وا رەنگ و شەرتا ئەوێت خودێ درستکری.

٢- زکات: فەرزە لسەر مروڤێ بوسولمان هەمی سالێ پشکەکێ ژ مالێ خوه دەربێخیت کو زکاتە. خودێ یێ گۆتی: (وآتو الزكاة)[17] زکاتا مالێ خو دەربێخن ئەڤ کارە دەرئێخستنە پاکژکرنا گیانیە ژ رەزیلیێ و پاکژکرنا مالیە ژ بێ بەرەکەتیێ. هەم ریکەکە ژ ریکێت نەهێلانا فەقیریێ.

٣- فایدە بوینەکا چاك و درست بکارئینانا مالیدا. نابیت مالێ خو ونداکەت د ریکێت حەرامدا. یان دریکا وا تشتادا ئەوێت فەر نەبن. ئو ئەو کارێن کینێ ئو حەسویدیێ د چینن دمابەینا بوسولمانادا.

## ئیسلامەتی و مولکینی

د ئیسلامەتیێدا مافێ ملکینیێ یێ پاراستیە ل رەخەکیڤە بەلێ یێ ژمارتیە لرەخەکێ دیڤە. بشریعەتیڤە. لەوا بەشەر نەیێ ئازایە دپەیداکرنێدا د کیش ریکا حەزکەت. ئەو نەشێت ب کاربینیت ئەو تشتێ هەبیت یان وەرگێریت دژیاناخوودا و پشتی مرناوی چەوا ئەو حەزکەت. ئیسلامەتیێ هندەك ڤەگرتنێت دانای لگەل ئەگەرێت هەبوینێ و پەیداکرنێدا چەواڤی مالەی دێ بکارئینیت و ریکێت وەرگرتناوی ئەڤەژی هندەکن ژوا:-

ڤەگرتنێت لگەل ئەگەرێت هەبوینێ و ملکینیێ.[18]

ئیسلامەتیێ نەهێلایە هەبوین رابیت لسەر نەحەقیێ. ڤیلیێ. تەزویریێ. ستاندنا بخورتی. دزیێ. خارنامالێ ئیکی بێ بەرامبەرو بێی رازیبوینا خودانێ مالی و دل رحەتیاوی. (المأخوذ حياء كالمأخوذ غصباً) ئەو تشتێ تو ژئیکی وەرگری دریکا شەرمێدا هەروەکی تو ژێ دستینی. هەروەکی گەلەك کەسا هەکە تشتەکێ تازە لدەڤ یێکی دیت تا تشتێ بچویکژی بیت بێژتێ ئەڤ تشتە چەندێ تازەیە خودان دشەرمێت خودا بێژتێ بوخو وەرگرە بلا بوتەبیت ئەوژی هەلگریت هەروەکی ژیستاندی و حەرامە. هەروەها هەکە یێك کەفتیتە بەرتەنگیەکێ یان یێ عەقل لەوازبیت یێك بێت ڤی رەوشەی بکەتە فەرسەت دا تشتێ وی ئەرزان لیکریت یان ژبەر دەستێ بێنەدەریێ بهندەك قەسێت نەدرست یان لسەرریێ ببەت ئەڤ کارە حەرامە. خودێ تەعالا دبێژیت:

(يا أيها الذين امنوا انفقوا من طيبات ما كسبتم ومما اخرجنا لكم من الارض ولا تيمموا الخبيث منه تنفقون ولستم بآخذيه الا ان تغمضوا)[19]

ئەی گەلێ باوەرکەرا خێرو چاکیا بکەن ژ تشتێ پاك و پاکژ یێ وە کەهاندی یە دەستێ خو ئو یێ مە دەرئێخستی بووە ژ عەردی هنك یێ خراب ژێ نەگرن، وی بکەنە خێر ئەوێ هەکەیێك بدەتە هنگو هنك وەرناگرن ئللا چاڤێت خو بنقینن نیشانێ نەدلیە. ئەڤە نیشاندانە بووی کەسی ئەوێ زکاتێ بدەت نەسەح لیکەت تشتێ کێم بها وی دەربێخیت هەر بێدەرەکێ زکاتا وێ یە. جۆتیار دبێژن شکارتە هەر شکارتەکی زکاتا وێ دێ دەت. هەکەیێ باشبیت یان کێماسی لێهەبن. هەروەکی گەنمێ ئیتالی زکاتا وی گەنمێ ئیتالیە. گەنمێ مەکسیاك زکاتاوی مەکسیاکە. نەگەنمێ تازە زکاتێ ژ گەنمێ کویری بدەت نابیت.

زبەرزترین دەرەچێت زکاتێ ئەون بوسولمان چێتر ین تشت بدەت، و ژدل بدەت دلێ وی ددویرا نەبیت. لگەل وێ چەندێ ئەڤ ئایەتە نیشانە بودویرئێخستنا مروڤێ بوسلمان ژ هەبوینا هەر تشتەکی دریکا پیس و خرابدا ئیسلامەتی هەبوینێ حەرامدکەت د هەر ریکێت زورداریێداو بەرتەنگیێدا هەروەکی حرامکری ریباو ڤەشارتنا تشتی و قمارو زوری و دزی و بەرتیل، لڤێرە هەژی راوەستانەکێیە دێ بێژن فلان گوند ین فلانکەسیە بێی کو پسیارکەن ئەری ئەمی ب چ رەنگ ئەڤ گوندە کریە ین خو..؟

هندەك دێ بێژن مەیێ کری ئەرێ کەس هەیە بشێت گوندەکی بکریت. ئەو کیش مەلایە ل کوردستانێ بەحسێ ڤی کارەی کربیت و بەحسلێکەت. لەوا فەرزەکا ئیسلامیە ئەڤ بابەتە بێتە بەحسکرن لسەر بنیاتێ قورئان و حەدیسێ. گەلەك کەسێت هەین بخورتیا خو گوندێت خەلکی ستاندین.

گەلەکا دەمێ داگیرکرنا ئنگلیزی و مەلیکاتیا پاشکەفتی پ بەرتیلاو زێرا هندەك گوندێت ئێخستینە سەر ناڤێ خوو دبێژن ئەڤە گوندێت مەنە لەوا دئیسلامیتێدا هەکە ریکێت خار بکارهاتبن بو هەبوینا مولکی ئەو موللك یێ حەرامە پێغەمبەر سلاڤێت خودێ لسەربن دبێژیت: (من ظلم شبرا من الارض طوقه الله من سبع ارضين)[20] ئەو کەسێ بۆستەکا عەردی ژئیکی بستینیت بخورتی خودێ تەعالا دێ وی کەسی بەتە خارێ دبن حەڤت تەبەقادا. پا چەوا ئەو کەسێت چەندگوند ب بەرتیلاو حیلاو خورتیێ د گەلەك جارادا ئێخستبنە سەر ناڤێ خو دێ حالێ وا چ بیت. پسیارا خو ئاشکرا دکەت ئەڤ عەردە چەوا دێ هێتە ئاشکراکرن و ڤەبەشین. ئیسلامەتی دبێژیت: ئەو کەسێ نەشێت دەلیلێت خو و شاهدێت خو یێت راست بینیت کو ئەڤ جهەیێ وی یە دەولەت وا جها دێ بەلاڤەکەت لسەر جوتیارا برەنگێ حەقی.

هەروەها ئیسلامەتی حەرام دکەت ملکینیێ و هەبوینێ هەکە زەرەرو ئێشان ڤ ملەتی بکەڤیت وەکی بازرگانیا لگەل دوژمناو بازرگانی بتشتێت حەرام وەکی ئارەقێ و کارێت سەر خوشیێ. یان هندەکا گەلەك عەردێ ددەستیداو جووتناکەت دوی دەمی دا بهزاران فەقیرێت هەین دبێ کارو عەمەل درووینشتینە لبن دیوارا هاڤینێ و زستانێ ئەڤ کەسێ هە عەرد دێ ژێ هێتە ستاندن و بەلاڤەکەن لسەر جوتیارا. ئەڤەیە ئیسلامەتی رەحمەت و دلوڤانی بو هەمی خەلکی.

ژ ریکێت ئیسلامەتیێ ئاشکراکرین بۆ هەبوینێ و مولکینێ ئەڤەنە :[21]

١ـ کار : ئیسلامەتیێ مروڤێ بوسولمان دڤێت شوٚلکەت و تشتی بوٚ خوٚ پەیداکەت. ئیسلامەتێ برەنگەکێ پیروٚز بەرێ خو ددەتە شولکرنێ ئەڤ کارە چەندی بجویکبیت. چ ساخکرنا عەردی بت. ب چاندنێ. دەرئێخستنا ئەویێ دناڤ زکێ عەردیدا. کرین و فروٚتنبیت. کار ب کەروەبیت.

٢ـ میرات : ئیسلامەتێ ئێعتیرافێ ب میراتی دەکەت و قورئانا پیروٚز بخو گەلەك یێ بەحسلێکری ئەڤەژی دا باب خو ماندەیکەت و زاروٚکێت وی لدوی وی ژیانەکا تازە بژین.

٣ـ دەولەت بخو هاروٚکاریا وەلاتیا دکەت ژ ـ بیت المال ـ دا موحتاجیێت خو بقەتینن و فایدەی ژ مولکێ خو ببینن کو عەردێ خو بچینن و دەینێت خو بدەنەڤە. گەلەك جارا دەولەت ژ مولکێ خو ددەتە رەعیەتێ هەکە ئەڤ عەردە یێ بەتالبیت. یان ئەو عەردێ کەسێ خو نەبیت هەروەکی پێغەمبەری سلاڤێت خودێ لێبن عەرد دایە هندەك سەحابیا.

٤ـ حەقێ هەر پێتڤیەکی یێ هەی دناڤ مالێ دەولەتێ ئەویێ دبێژنێ (بیت المال) بەلێ دوی دەمیدا هەکە یێك نەبینیت شوولێ یان نەشێت شوولکەت ژ بەر نەخوٚشیێ یان یێ بعەمربیت یان رەنگێت دی وی دەمی شریعەت فەرزدکەت خودانکرنا وی هەکە کەسێ خوو نەبیت خودانکرناوی لسەر ـ بیت المال ـ ە ئەو مالێ خەلك وەردگریت بیێ بەرامبەرو ماندی بوین چ ل رەخێ خزماتیێ ڤەبیت د ژیاناوادا وەکی خەلاتا یان برەنگێ دوعاهیا ژیانێ بیت وکی وەسیەتێ بەلێ بشەرتێ هندێ کو وەسیەت بو وارسا نەبیت. یان ئەڤ پارە ژ مروٚڤەکێ بویانێ بوٚ بێت.

لسەر ڤەگێرانا وەسیەتێ وەسیەت بوٚمروٚڤێت بیانی یە نابیت مروٚڤەك وەسیەتەکێ بکەت بوٚواکەسا ئەوێت دبنە وارس هەروەکی مروٚڤەك خانیەکێ لسەرناڤێ کورەکێ خو چێکەت یان بوٚ بنڤیسیت تشتەکی کو وەرگریت پشتی مرناوی چنکو دوژمناتیێ چێدکەت دمابەینا برادا لەوا پێغەمبەر (س) دبێژیت: (لا وصیة لوراث)[22] رواه احمد وابو داود والترمذي.

نابیت وەسیەت بوٚ وارسا.

## ژێدەرو پەراوێز


١ـ ژ نڤیسینێت ـ یاسین زێیاری ـ ل معهد التاريخ العربي للدراسات العليا. ل بەغا .ل دەرسا (رێبازا ئابوری د دەولەتا عەرەبیا ئیسلامی) سەیدایێ ماددەی د. محمد تقي عبد سالم العاني. سالا ١٩٩٣م.

٢ـ سورة الحشر . اية (١٩).

٣ـ سنن النسائي باب الجهاد.

٤ـ اخرجه السيوطي في الجامع الصغير.

٥ـ مسند احمد بن حنبل. بەرگێ نەهێ.

٦ـ سورة البقرة (٣٠).

٧ـ سعد المرصفي. الجامع المفهرس لالفاظ صحيح مسلم. مطبعة شركة ذات السلاسل (١٩٨٨م). ٢/٣٨. صحيح مسلم. باب الذكر. تسلسل (٢٧٤٢) مستدرك الحاكم.

٨ـ سورة البقرة (١٤٣(.

٩ـ سورة البقرة (٢٧٩).

١٠ـ الطبراني. الحافظ ابوالقاسم. سليمان بن احمد (ت ٣٦٠هـ) طبعة ـ ٢ ـ مطبعة الزهراء. الموصل (١٩٨٤م). ٢/٨٦. ورواه احمد بن حنبل.

١١ـ عزالدين بليق. منهاج الصالحين. بيروت (١٩٨٢م) ل ـ ٦١١ ـ ومحمد الغوالي ـ الاسلام والاوضاع الاقتصادية.

١٢ـ سورة الجمعة ـ ١٠ ـ.

١٣ـ سورة الذاريات ـ اية ـ ١٩ ـ.

١٤ـ سورة التوبة ـ اية ٣٤.

١٥ـ الصابوني. محمد علي. بيروت (د.ت) ١/٥٣٤.

١٦ـ سيد سابق. فقه السنه (١/٣٣٥).

١٧ـ سورة المجادلة ـ اية ـ ١٣.

١٨ـ د. تقي عبد سالم. الملكية في الاسلام بين الفردية والجماعيه. مجلة تنمية الرافدين جامعة الموصل كلية الادارة والاقتصاد. مجلد ـ ١٢ ـ كانون الثاني ـ ١٩٠م ـ ل ـ ١٦٢ ـ و ـ علي الخفيف. الملكية الفردية وتحديدها في الاسلام. بحث منشور في المؤتمر الاول لمجمع البحوث الاسلامية ـ الازهر (١٩٦٤م) ل (١٢١).

١٩ـ سورة البقرة اية ـ (٢٦٧).

٢٠ـ صحيح البخاري باب المظالم (١٢).

٢١ـ د. تقي عبد سالم، مجلة تنمية الرافدين (١٩٩٠م) ل ـ ١٦٤ ـ عبدالسميع المصري، نظرية الاسلام الاقتصادية، مكتبة الانجلو المصرية. القاهرة (١٩٧١م) ل (٤٥/٤٦).

٢٢ـ صحيح البخاري. باب الوصايا ـ ٦ ـ، سنن ابي داود باب الوصايا، مسند احمد بن حنبل ٤/١٨٦.


## کورتیا گوٚتارێ


ئەڤ وتارە بەحسی هزرا ئابوٚریا ئیسلامی دکەت، پشتی زانینگە هێت ئیسلامی و جیهانی دەست پێ کر لسەر دنڤیسن، کو هزرا ئابوٚریا یائسلامی هەرئەوە ئومێدو ئاواتێت جیهانی ب جهـ دئینیت چنکو هەمی رەخا دگریت و بەرژەوەندیاگشتی دگریت، لگەل ڤێ چەندێ کو هەردی کوردستانێ ستوینەکامەزنە بو ئابوریێ، بەلێ ئەوب درستی بکارنە هاتیە، لەوانڤیسە ڤانی بەحسلێکر، ئاشکراکر کوهەبوینی و مولکیەت ماڤێ هەربەشەرەکیە، یێ نڤیە هەربەشەرەکی بشك هەبیت ل خارنێ و ڤەخارنێ و خانی ی و ژنکێ.

## ملخص البحث بالعربية

يتضمن البحث دراسة موجزة في جوانب من الفكر الاقتصادي الاسلامي العالي الذي اصبح الملجأ والملاذ للانسانية من جديد بعدما عجزت المذاهب الاقتصادية البشرية مرة اخرىٰ في القرن العشرين عن تحقيق السعادة والرفاهية للبشر. وذلك ان الاقتصاد الاسلامي يجمع بين المادة والروح ويهتم بمصلحة المجتمع والفرد معاً علىٰ اساس العدالة الالهية وكذلك ان الاقتصاد الاسلامي شأنه شأن الشريعة الاسلامية التي تقبل التطور وتكون شاملة لكل زمان ومكان وان الشريعة الاسلامية تهدف الىٰ توفير الرفاهية للانسان وحق البشر في الاكل والشرب والسكن علىٰ اساس الهي عادل لاعلىٰ اساس الكفاف وان ذلك مسؤولية جميع البشر، ثم يتعرض الباحث الىٰ الملكية والقيودالتي تفرض علىٰ حق التمتع بالملكية. وفي كل ذلك يستند الباحث علىٰ اسس متينة من القرآن والسنة النبوية الطاهرة والكتب والبحوث الحديثة والكتابات الخاصة من اساتذة الاقتصاد الاسلامي الذي يدرس في الجامعات العراقية والعالمية.

### الباحث في سطور


* مواليد عام ١٩٥٩، قرية شني، قضاء عقرة.
* اكمل الابتدائية في عقره عام ١٩٧٠.
* اكمل المعهد الاسلامي في سامراء عام ١٩٧٦.
* حصل علىٰ شهادة البكالوريوس في العلوم الاسلامية، من كلية الشريعة، جامعة بغداد عام ١٩٨١.
* حصل علىٰ شهادة الماجستير في التأريخ الاسلامي عام ١٩٩٥م.
* عمل في تقديم الاحاديث الدينية في الاذاعة الكردية وتلفزيون التأميم، وتلفزيون بهدينان، وتلفزيون بغداد، منذ عام ١٩٨١م ولحد كتابة هذه السطور.
* عمل في التدريس في مختلف الاعداديات في بغداد نحو عشر سنوات.
* عضو اتحاد المؤرخين العرب.
* عضو اتحاد الادباء والكتاب العراقيين.
* عضو اتحاد الادباء والكتاب العرب.
* خبير قضائي في وزارة العدل.
* عضو جمعية الثقافة الكردية.
* عضو نقابة الصحفيين العراقيين.
* امام وخطيب جامع سعيد بن زيد، في بغداد منذ عام ١٩٧٣م ولحد كتابة هذه السطور.
* له اكثر من الف نتاج فكري.
* طالب دكتوراه الآن.


# لاستیكی سروشتی و لاستیكی دەستكردو پیشەسازی یەكانیان

دكتور: ذنون پیریادی



## پوختەی وتار

له مێژەوه مرۆ لاستیكی سروشتی[1] ناسیوەو بەكاری هێناوه بەبێ ئەوەی ئاگاداری پێكهاتوی كیمیایی[2] بێت. بەلاّم لاستیكی دەستكرد مادەیەكی گرنگی نوێ یە تەنانەت (٨٠) سالێك لەمەوبەر مرۆ لەتاقیگەدا[3] دروستی كردوه بێ گومان لاستیك بە هەمو چەشن و جۆرەكانی یەوە مادەیەكی سەرەكی شارستانی یەتە چونكە بەبێ لاستیك ئەو هەمو ئۆتۆمۆبیل و فرۆكەو صەدەها ماشین پەكیان دەكەوێت.

ئەم لێكۆڵینەوەیە دەربارەی لاستیكە بەشیوەیەكی دورو درێژ. لەپێشا باسێكی مێژوی لاستیكی سروشتی دەكەین لەپاشان باسی هەوڵ و كۆشش و لێكۆڵینەوەكانی زاناكان دەكەین سەبارەت بە پێكهاتوی لاستیك

هەتا گەیشتن بە دروستکردنی لاستیکی دەستکرد. لەپاشان باسی نوێ ترین تەکنولۆ- یای پیشەسازی لاستیك دەکەین بە درێژی لە جیهاندا.

## مێژوی لاستیکی سروشتی [٤]

مێژوی دۆزینەوەو بەکارهێنانی لاستیکی سروشتی زۆر دێرینە بەلاّم یەکەم میللەت لاستیکی سروشتی ناسیوە هاولاّتیانی باشوری خۆرهەلاّتی ئاسیا بون واتە ولاّتەکانی: ئەندنۆسیاو مالیزیاو سۆمەترە وئەوانی تر.
هاوولاّتی یەکانی ئەم ناوچەیە بەرێکەوت فێربووبون شیرەی [٥] دارێکی تایبەتی یان لەگەڵ کەمێك لەگۆگرد [٦] تێکەڵ دەکردو دەکولاّند وبەم جۆرە لاستیکیان دەست دەکەوت. بەو جۆرە دارە دەڵێن: [دارە لاستیك [٧]] ئەم مادەیە واتە لاستیکی سروشتی لەولاّتەکانی ئاسیاو ئەوروپادا بلاّو بوەوە.
لەلایەکی ترەوە هەندێك مێژونوس دەڵێن: زانیاری ئەوروپا دەربارەی لاستیکی سروشتی لە سەرەتادا لەئەمەریکاوە واتە (جیهانی نوێ وە [٨]) وەرگیراوە. لە ساڵی (١٧٣٦) هەوڵەکانی هەندیك لەئەوروپایی یەکان بۆ رواندنی دارلاستیك سەرکەوتوو نەبوو چونکە ئەوروپا ولاّتێکی ساردەو درەختی لاستیك پێویستی بە کەشو هەوایەکی گەرم وپرلەشێ یە.
ناوی لاستیك بە ئینگلیزی (رەبەرە) واتە **Rubber** [٩]. ئەم وشەیە لەساڵی (١٧٧٠) دارێژرا لەلایەن کیمیازانی ناسراو جوزیف بریستلی. بریستلی ناوی لاستیکی نا بە **Rubber** واتە (دەسرێتەوە) چونکە نوسینی قەڵەمی رەشی دەسرێەوە.
هەر وەکو گوتمان لەسەرەوە تێکەڵ کردنی رێژەیەکی کەم لەگۆگرد لەگەڵ لاستیکی سروشتی و کولاّندنیان بە یەکەوە لاستیکێکی بەهێز دروست دەکات و دەشێت تایەی سەیارەی لێ دروست بکرێت.
خاوەنی کومپانیای جیهانی (کومپانیای گودیێر **Goodyear** [١٠]) لەئەمەرنی یەکەم کەس بوو کەتەکنۆلۆجیای کارلێکردنی گوگرد لەگەڵ لاستیکی سروشتی تێ بگات و وەسفی بکات. ئەم زاناو سامان دارە ناوی چارلس گودبیرە وگەلێك تاقی کردنەوەی بەسەر لاستیکی سروشتیدا ئەنجام دا. گودبیر ناوی کارلێکی گوگرد لەگەڵ لاستیکی سروشتی دا نا بە وشەی (ڤەلکەنە) واتە **Vuleanigation** واتە کارلێکی کیمیایی نێوان لاستیکی سروشتی و گوگرد. ئەم تەکنولۆجیایە نرخی لاستیکی بەرزکردەوە چونکە بەزۆری بۆ ئوتومۆبیل بەکاردەهێنرا وژمارەی ئوتومۆبیل زۆر بوو. بەلێ لەسەرەتای سەدەی بیستەم دا لاستیکی سروشتی گران بوو وبەشی پێویستەمەنی ئەوروپای نەدەکرد. بۆیەکە زاناکان دەستیان کردە لێکۆلینەوەی گەرم وگور بۆ ئەوەی لاستیکی دەستکرد جێ بەجێ بکەن.
شیانی باسە زۆرترین لاستیکی سروشتی لە ناو دارێکی لاستیك بەناوی (هیڤابراسیلینس **Hevea Brasiliensis**) دروست دەبێت وەکو شیریکی سپی ولینج. ئەم درەختە لەبنەرەتا لەهەرێمی روباری ئەمەزۆن لەئەمەریکای باکوردا سەری هەڵداوە. بەلاّم لەم دوایی یەدا درەختەکە بەخێو دەکرا بۆمەبەستی لاستیك.
لەماوەی جەنگی جیهانی یەکەمدا رێگای بازرگانی نێوان ئەوروپاو دەولەتە رۆژهەلاّتەکان گیراو هەرگیز بەئاسانی لاستیکی سروستی لەولاّتەکانی رۆژهەلاّتەوە نەدەگەیشتە ئەلمانیا. ئەلمانیاش بەتایبەتی پێویستی بەلاستیك هەبو بۆ سوپاکەی. لەبەرئەوە هانی زاناکانی ئەلمانیا درا بۆهەوڵ وکۆشش بۆ دروستکردن وئامادە کردنی لاستیکی دەستکرد. ئەم هەوڵ وکۆششە بەری گرت و زاناکان لاستیکی سروشتی یان لەپێشا شی کردەوە بۆ زانینی پیکهاتوی مادەکە. لەپاشان هەولیان دا لاستیکی دەستکرد ئامادە بکەن وهەولەکانیان سەرکەوتو بوو وەکو لەلاپەرەکانی ئایندەدا باسی دەکەین. پێویستە لێرەدا بلێین پاش دۆزینەوەی رێگای ئامادەکردنی لاستیکی دەستکرد بەتایبەتی لەمەلبەندی نەوتەوە، بەلاّم هەمیشە لاستیکی سروشتی لەبازارا زۆرەو کارگەکانی لاستیك هەردو چەشن پیشەسازی دەکەن واتە لاستیکی دەستکردو لاستیکی سروشتی شان بەشانی یەك دروست دەکرین و دەفرۆشرێت

## سەرەتای دروستکردنی لاستیکی دەستکرد

هەروەکو لەسەرەوە گوتمان هەوڵ وکۆشش بەگەرمی لەماوەی جەنگی جیهانی یەکەمدا دەستی پێ کرد لە ئەلمانیا، بەهۆی نەبونی لاستیکی سروشتی.
بۆ ئەوەی پیکهاتوی لاستیکی سروشتی بزانن چی یە؟ زاناکان لاستیکی سروشتیان دلۆپاند [١١] لەبارو دوخێکی تایبەتی داو مادەیەکیان دلۆپاند پێی دەڵێن ئایسۆپرین. واتە:
لاستیکی سروشتی دلۆپاندن ئایسۆپرین
مادەی ئایسۆپرین لەباردوخی ئاسایی دا غازە بەلاّم ئەتوانرێت بە گوشارو ساردکردنەوە بگۆرێتە باری شل. دووبارە زاناکان هەڵسان ئایسۆپرینەکەیان گەرم کردەوە بە ئامادەبونی ترشێکی کەم ولە ئەنجامدا مادەیەکی لینج وجیرپان دەست کەوت وەکو لاستیك. ئەم دۆزینەوەیە دەرگای بۆئامادەکردنی لاستیکی دەستکرد کردەوەو چەن ساڵێکی پێ نەچوو دوو جۆر لاستیکی دەست کرد خرانە بازارەوە:
١. لاستیکی (پولی ئایسوپرین)
٢. لاستیکی (پولی بیوتادایین)
هەروەها لەساڵی ١٩٣٥ کارۆئەرس لاستیکێکی نوێی بۆ کومپانیای دووپۆنت **Du pont** ئامادەکرد وناوی لاستیکی (نیۆپرین)ی لێ نا.
ئەم لاستیکە توخمی کلۆری تیادا هەبو. بێ گومان بۆ ئەوەی مادەی پۆلیمە بێت بە لاستیك پێویستە ئەم سیفەتانەی خوارەوەی تیادا هەبێت:-
١- کێشی گەردی [١١] مادەکە پێویستە زۆر بەرز بێت.
٢- مادەی لاستیك پێویستە بلوری [١٥] نەبێت واتە رێژەی بلوری تیایادا

پێویستە سیفر بێت.

٣- ئەلقەكانی زنجیرەكەی پێویستە بەجۆرێك بن كە بتوانن لول بكرێن بەبێ ئەوەی بپچرێت. [١٦]

٤- پەیوەندی یەكی كەم نێوان گەردەكانیان هەبێت باشترە واتە هەتا رادەیەكی كەم گەردەكان بەیەكەوە لكابێتن باشترەو بەهێزترە.

هەمو لاستیكێك سیفەتێكی تایبەتی پێ وێنەی هەیە ئەویش سیفەتی جیرێتی بەواتە (المرونە). ماوەی لاستیك بە ئاسانی نابچرێت ئەگەر هاتو راتكێشا لەدوولاوە ئەوا لاستیكەكە درێژ دەبێت بەڵام كەدەستت بەردا قەبارەو وێنەی لاستیكەكە دەگەرێتەوە باروودۆخی جاران بەبێ هیچ گۆرانێك. گەلێك مادەی تری پلاستیك هەن هەمیشە بەراكێشان درێژدەبێتەوە ودەكشێت بەلام كە دەستت لە راكێشان بەردا سەیردەكەی مادەپلاستیكەكە ناگەرێتەوە دۆخی جاران و بەڵكو درێژ دەبێت. واتە ئەم جۆرە مادەیە بەلاستیك ناژمێرێت.

## پێكهاتوی لاستیك

ئایا لاستیك چی یەو لەچی پێكهاتوە؟؟ وەلامی ئەم پرسیارە ئەمەیە:
هەمو لاستیكێكی بازرگانی لەدوو جۆرە چەشن مادە دروستكراون.

(١) مادەی لاستیكە سەرەكی یەكە، واتەپۆلیمەری لاستیك

(٢) جۆرەها مادەی تری تێكەڵ كراو وەكو:

١ - گوگرد بۆ (تۆركردن [١٩] ) زنجیرەكانی پۆلیمەر.

٢ - مادەیەكی پركەرەوە [٢٠] (واتە مادە مخشیە) وەكو رەشایی كاربۆن.

٣ - مادەی چالاك كەر بۆ چالاك كردن كارێكی كیمیایی گوگرد لەگەڵ لاستیكدا.

٤ - مادەی كاربگەركەر واتە **Activater** ئەم جۆرە مادانە چالاكی چالاك كەرەكان زیاتر دەكات.

هەندێك جار بەم مادانە دەڵێن (چالاك كەری دووەم).

٥ - مادەی (تۆربون) كەم كەرەوە واتە [٢٢] **Volcanijation Retarders**.

٦ - مادەی پیروكسید هەندێك جار بەكاردەهێنن.

٧ - مادەی دژ بە ئۆكسیدین واتە (مانع الاكسدة).

٨ - مادەی دژ بە ئۆزۆن.

بێ گومان ژمارەی مادەی لاستیكی واتە جۆری یەكەم زۆر نین بەڵكو پۆلیمەر زیاتر نین. كەچی ژمارەی مادەكانی تری تێكەڵ كراو لە (٢٠٠) مادەو ئاوێتەی جۆراو جۆر زیاترن.

لەراستیدا حەوت جۆر لاستیك لەبازارەكاندا هەیە لەخوارەوە هیمای گەردیانی[٢٤] نەخشی دەكەین:

١ - لاستیكی( **SBR**) واتە لاستیكی ستایرین - بیوتەداین. [٢٥]
ئەم مادەیە لە هەمو لاستیكە دەستكردەكان باوترەو لە دوو مادەی كیمیایی دروست دەكرێت: ستایرین و بیوتەداین. [٢٦]



Styrene - butadiene rubbre

٢ - لاستیكی ئەثیلین - پروپیلین: [٢٧]
ئەم لاستیكە لەئاوێتەی ئەثیلین و پروپیلین دروست دەكرێت.



Ethylene - propylene copolymer

٣ - لاستیكی بیوتیل واتە **Butyl Rubber** . ئەم پۆلیمەرە لە پەلەرینی [٢٧] بیوتیلین و ئایسوپرین دروست دەكرێت.



Butyl rubber

٤ - لاستیكی پۆلی (بیوتەداین). ئەمەش لەئاوێتەی بیوتەداین دروست دەكرێت.



Polybutadiene rubber

٥ - لاستیكی (ئەثیلین - پرۆپیلین - داین) واتە ئەم پۆلیمەرە لە سێ كۆئەندام دروست كراوە: ئەثیلین وپرۆپلین و لەگەڵ ئاوێتەی داین وەكو بۆ وێنە دای سایكلو - پێتادایین یان 4/1 - هێكسادایین.



Ethylene - propylene - diene terpolymer

٦ - لاستیكی پۆلی (ئایسوپرین) **Poly soprene** . ئەم لاستیكە لە پۆلیمەرینی غازی ئایسوپرین دروست دەكرێت. شیانی باسە لاستیكی سروشتی لەروەكدا بە هۆی پۆلیمەرینی ئایسوپرینەوە پێك دێت. [٢٩]

٧ - پۆلی (كلوروپرین) لاستیكی نایابەو توخمی كلوری تیادا هەیە لەكلوروپرین دروست دەكرێت.



Polychloroprene rubber

٨ ـ لاستیکی نایتریل (Nitrile Rubber ). ئەم لاستیکە لە پۆلیمەرینی اکریلۆنایتریل و بیوتەداین ئامادە دەکرێت.



Nitrile rubber

٩ ـ لاستیکی سروشتی واتەپۆلی ئایسۆپرینی سروشتی ئەم لاستیکە وەك دروستی دەکات و ئادەمیزاد دەستکاری دەکات.



Natural rubber

## چەن خاڵێکی دیار لەمێژوی لاستیکدا

وشەی لاستیك Rubber هەندێك کەس بۆ لاستیکی سروشتی بەکاری دەهێنن کەچی پەلاستیك دروستکراوەکان دەڵێن: لاستیکی دەستکرد. هەروەکو لەپێشەوە گوتمان لەسەرەتای ئەم چەرخە زاناکان لاستیکی سروشتیان شی کردەوە هەستان لەتاقی گەدا دروستیان کرد. پاش دروستکردنی لاستیك لەتاقی گەدا گەلێك هەوڵ و کۆشش درا بۆپێش خستنی کیمیاو تەکنولۆجی لاستیك لەخوارەوە گرنگترین دۆزینەوەو داهێنان و پێش کەوتن لەبواری لاستیکدا نیشان ئەدەین:ـ

ـ ساڵی ١٨٣٩: چارلس گودیر Good yean کارلێکی گۆگرد لەگەڵ لاستیکی سروشتیدا دۆزیەوە. بەم کارلێکە دەڵێن (فەلکەنە) واتە Vul eaniyation ولاستیکەکە بەهێز دەکات.

ـ ساڵی ١٨٧٦: (هێزی وێکهام Henry Wiekham ) (٧٠٠٠٠) حەفتاهەزار دانە تۆوی دار لاستیکی هێنا بۆ لەندەن و تۆوی کردو لەپاشان بردی بۆ دورگەی سەیلان بۆ بەرهەم دانی لاستیکی سروشتی.

ـ ساڵی ١٨٨٨ جۆن بۆید (٣٠) دەنلۆپ John Boyd Pumlop مافی داهێنانی دروستکردنی تایبەکی تایبەتی لە پێلفاست (لەئیرلەندە) تۆمارکرد.

ـ ساڵی ١٩٠٠ دکتور فریتز هۆفمان Frity Hofmann یەکەم مافی داهێنانی لەبواری لاستیکی دەستکرد تۆمارکرد.

ـ ساڵی ١٩١٠ لاستیکی سروشتی گران بوو. کیلۆیەکی گەیشتە حەوت دۆلاری ئەمەریکی.

ـ ساڵی ١٩١٦ لاستیکێکی دەستکرد هاتەبازارەوە لە ئەڵمانیا بەناوی لاستیکی مەثیل واتە ( Methyl Rubben ) ئەم لاستیکە لە پەلەرینی دای مەثیل بیوتەداین دروستکراو مانگی (١٥٠) تۆنیان لێ دەفرۆشت.

ـ ساڵی ١٩٢٩ لاستیکی دەستکرد وەکو لاستیکی (SBR ) یان لاستیکی بیوتیل لە ئەڵمانیا دروست دەکرا.

ـ ساڵی (١٩٣٢) لاستیکی سروشتی هەرزان بوو.

ـ ساڵی (١٩٣٩) بەرهەمی ئەڵمانیا لەلاستیکی دەستکرد گەیشتە ١٥٠٠٠٠ تۆن ساڵی. هەروەها بەرهەمی سۆڤیات گەیشتە ٩٠٠٠٠ تۆن ساڵی.

ـ ساڵی ١٩٤٥ بەرهەمی ئەمەریکا لە لاستیکی دەستکرد گەیشتە ٧٠٠٠٠٠ تۆن ساڵی.

ـ ساڵی ١٩٥٠ لاستیکی سروشتی هەرگیز پیانەدەگیشت بەپێویستەمەنی جیهانەوە.

ـ ساڵی ١٩٧٩ بەرهەمی لاستیك لەوڵاتە سەرمایەدارەکاندا گەیشتە ٦،١٦٧ ملیۆن تۆن.

## چەن لاستیکێکی تایبەتی دەستکرد

ئەم جۆرە لاستیکانە بەقەبارەیەکی کەم پیشەسازی دەکرێن بەلام نرخیان گرانە وبۆ مەبەستی تایبەتی بەکەڵك دێن. بۆ وێنە:

### ١ـ لاستیکی ئەکریلیك:

ئەم لاستیکە بەتەکنولۆجیای تایبەتی لەم ئاوێنانەی خوارەوە دروست دەکەین:

أـ ئەکریلاتی ئەثیل. [٣٣]

ب ـ ئەکریلاتی ئیثۆکسی.

جـ ـ ئەکریلاتی بیوتیل.

د ـ ئەکریلاتی أیثوکسی أثیل ئەکریلات.

ساڵی پێنج ملیۆن کیلوگرام لەم لاستیکانە دەفرۆشرێن لە لایەن ئەم کومپانیانەوە: کومپانیای سیانامید، وکومپانیای دوو پۆنت وکومپانیای گودریچ B. F. Goodrieh .

## پۆلی ئەثیلینی دەستکاری کراو

ئەم مادەیە چەشنێکی تایبەتی یە لەپۆلی ئەثیلینی دەستکاری کراو. گەردی کلۆرو کۆمەڵەی سۆلفۆنیل دەخرێنە سەر ئەلقەکانی زنجیرەکەی پۆلی ئەثیلین. بەم جۆرە مادەیەکی بەهێزو توانا پێك دێت و بەرگری ئۆزۆن و ئۆکسجین هەوای هەیەو ئۆکسیدین [٣٤] نابن. هەروەها مادە نوێ یەکی بەرگری گەرماو بەرهەمەکانی پێزۆل و گەلێك مادەی تری هەیە. زۆربەی ئەم پۆلیمەرانە بۆ پێچانەوەی وایەری کارەباو

دروستکردنی پارچەکانی سەیارەو گەلێك شتی تر بەکاردەهێنرێت. ساڵی (٣٠) ملیۆن کیلۆی لێ دروست دەکرێت وکۆمپانیای [٣٦] دووپۆنت تەنها کۆمپانیای ئەمەریکایە بۆ دروستکردنی.

## ٣- چەن پۆلیمەرێکی هاوبەش

بەم پۆلیمەرانە بە ئنگلیزی دەڵێن: **Copolyester ethers** ئەم جۆرە لاستیکە لە پۆلیمەرێنی دووجۆر ئاوێتە دروست دەکرێت: پۆلی (بیوتیلین پترفثالات) **Poly ( butylene Tenphthalate)** لەگەڵ پۆلی (تیترامەثیلین أیثر گلایکۆل تیژفثالات). مادەکە زۆر بەهێزەو بەئاسانی نارزێت وناخورێت هەروەها بەرگری باشی هەیە دژی نەوت و تونەرە کیمیایی یەکان. [٣٨] دەهەزار تۆن لەم لاستیکە دەفرۆشرێت ساڵی وبۆ دروستکردنی سۆندەو پێچینی وایەری کارەبا بەکاردەهێنن.

## ٤- لاستیکی ئیپی کلۆرۆهایدرین:

پۆلیمەری تایبەتی لەم ئاوێتەیە دروست دەکرێت و سیفەتی لاستیکی هەیەو زۆربەی بەرهەمەکەی لە پیشەسازی ئۆتۆمۆبیلدا بەکاردەهێنن وەکو گاسکێدی سەیارەو شتی تر.

## ٥- پۆلیمەری فلۆراوی:

ئەم چەشنە پۆلیمەرە فلوری تیادا هەیە ولاستیکەکەی زۆر بە هێزەو نرخیشی زۆر گرانە قەبارەیەکی زۆر کەمی لێ دروست دەکەن بۆ کارو پیشەی تایبەتی بەکەڵك دێت.

## ٦- پۆلی سۆلفاید:

ئەم چەشنە لاستیکە گۆگردی تیادا هەیەو سیفەتی زۆر نایابی هەیە وەکو سیفەتی بەرگری گەرماو ئۆزۆن و ئۆکسجین.

## ٧- لاستیکی سیلیکۆن:

پۆلیمەری ئەم جۆرە لاستیکە لەزنجیرەی سیلیکۆن پێکهاتوە لەگەڵ ئۆکسجین و هەندێك جار کۆمەڵەی ئەلکیل یان ئەرملیش لەم لاوەی هەیە. ئەم جۆرە لاستیکە بەرگری یە باشی هەیە دژی ئۆزۆن و شوهەواو و هایدرۆکاربۆنەکان. زۆربەی بەرهەمی ئەم جۆرە لاستیکە لەبواری زەمغ وکەتیرە بەکاردەهێنن.

## ٨ - بۆلیمەری بلۆکی گەرمابەرنەگر [٤١]:

پۆلیمەری بلوکی ئەو چەشنە پۆلیمەرەیەکە هاوبەشە لەگەڵ پۆلیمەرێکی تر بەڵام زنجیرەکانی هەمە چەشن بن بەڵکو پارچەیەك لەزنجیرەی گەردەکانی جۆرێکە کەچی پارچەیەکی تری جۆرێکی ترە. زۆربەیان لەپۆلی ستایرین و پۆلی بیوتەداین دروست دەکرێن. ساڵی زیاتر لە (١٥٠٠٠) تۆن لەم لاستیکە لەلایەن کۆمپانیاکانی ئەمەریکاوە بەتایبەتی کۆمپانیای (شێل) **Shell** دەفرۆشرێت.

## لاستیکی یورثیان:

ئەم چەشنە لاستیکە بەهێزە ماوەیەکی زۆر خزمەتی مرۆڤ دەکات. ئەم مادەیە بۆ دروست کردنی تایەی تایبەتی بەهێز بەکار ـ دەهێنرێت هەروەها بۆ کەتیرەو زەمغ بەهێزیش. ساڵی نزیکەی ملیۆنە تەنێك لەم لاستیکە دەفرۆشن. نرخی کیلۆیەکی نزیکەی چوار دۆلاری ئەمەریکی یە.

## پیشەسازی یەکانی لاستیك:

قۆناغەکانی پیشەسازی لاستیك دەکرێنە دوو بەشی گەورەوە:
١. پیشەسازی لاستیکی سروشتی.
٢. پیشەسازی لاستیکی دەستکرد.

## ١ - پیشەسازی لاستیکی سروشتی [٤٢]

قۆناغەکانی ئەم پیشەسازی یە دابەش دەکرێنە:ـ
١. هارینی لاستیکی سروشتی خاو بەهۆی ماکینەی تایبەتی بۆ ئەوەی گەردە درێژکانی لاستیکەکە بپچرێن و بەم هۆیەوە (لینجی) واتە (لزوجة) لاستیکەکە کەم دەبێتەوە.
٢. قۆناغی دووەم: گیرانەوەی تێکەڵە مادەکانە لەگەڵ هاراوەی لاستیکی خاوی سروشتی. ئەم مادانەی خوارەوە بەرێژەی تایبەتی و بەشێوەیەکی هاراو تێکەڵ بە هاراوەی لاستیکەکە دەکرێن.
أ ـ ئۆکسیدی زینك.
ب ـ ترشی ستیاریك **Stearie aciel**.
جـ ـ گۆگرد.
د ـ ماددەی (هاندەر) یان (تاودەر) واتەمادەی (موعەجل).
هـ ـ رەشایی کاربۆن واتە (هیس).
و ـ مادەی پرکەرەوە واتە **Fillers**.
ز ـ مادەی نەرمکەرەوە واتە (مادە ملینە) [٤٤].
ح ـ مادەی دژی ئۆکسیدین.
ط ـ هەندێك مادەی تر.
شیانی باسە هەمو مادەکانی سەرەوە بەشێوەیەکی هاراو بەکاردەهێنرێن.

باش ئەوەی مادەکان بەرێژەی دیاری کراو تێکەڵ دەکرێن ئەمجا گەرم دەکرێن و دەبن بەهەویرێکی رەش چینی یەکەمی تایەی لێ دروست دەکرێت بەهۆی ماشینی تایبەتی هەروەها چینی نوێ دەخرێتە سەر چینی کۆن و قوماشی نایلۆن وسیم بەکاردەهێنرێن بۆ بە هێزکردنی لاستیکەکە. ئەم هەمو گۆرانکاریانە بە ماشین [١٥] دەکرێن لە ژێر چاودێری کرێکاری پسپۆر. هەروەها چوپی تایەش پیشەسازی دەکرێت.

هەر مادەیەك لەوانەی بەکاردەهێنرێن سودوکەڵکی تایبەتی خۆی هەیە. لەوانە ئۆکسیدی [١٦] زینك بەکاردەهێنن بۆ چەن سودیك لەوانە بەهێزکردنی مادەکە وپاریزگاری کردنی دژی تیشکی سەرەوەی وەنەوشەیی تیشکی U V [١٧] ترسێ ستیاریك بەرێژەیەکی کەم تێکەڵ بەگیراوەی لاستیك دەکرێت بۆ ئەوەی لاستیکەکە نەتەلەشێت و درز بیات. گۆگرد پیشەیەکی گرنگی هەیە ئەویش گەردەکان لاستیك بەیەکەوە رایەڵ بکات و لەئەنجامدا شێوەیەك وەك شێوەی تۆر پێك بێت. رێژەیەکی زۆر کەم لەمادەیەکی کیمیائی تایبەتی تێکەڵ دەکرێت بەناوی (معجل) واتە (تاودەر). ئەم جۆرە مادانە خێرایی بە کارلێکە کیمیایی یەکان ئەدات وچالاکیان ئەکات. رەشایی کاربون واتە (أسود الکاربون) بە رێژەیەکی دیاری کراو تێکەڵ بە لاستیك دەکرێت وکەڵێك سوودی هەیە لەوانەبەرگری تیشکی سەروی وەنەوشەیی وپرکردنەوەی بۆشایی یەکانی نێوان گەردەکان. هەر چەنە مادەی پرکەرەوە واتە (مادەحشیە)یان Filler هەمیشە تێکەڵ دەکرێت بۆ رەق بونی لاستیکەکە. رێژەیەکی دیاری کراو لەمادەیەکی (نەرم کەرەوە) واتە مادە (ملینە) هەمیشە تێکەڵ دەکرێت بۆ ئەوەی مادەکە زۆر رەق نەبێت ونەتوانرێت پیشەسازی بکەن. مادەی دژ بەئۆکسیدین بە قەبارەیەکی دیاری کراو هەمیشە تێکەڵ دەکرێت بۆ پاریزگاری مادەی لاستیکەکە بە تایبەتی لە ئۆکسجینی هەواو ئۆزۆن.

بێ گومان ئۆکسجینی هەواو ئۆزۆن یەکەم دوژمنی لاستیکە چونکە بە بونەیانەوە لاستیك دەرزێت و کۆن دەبێت. ئەگەر هاتو لاستیك لەهەواو تیشکی رۆژ پارێزرا ئەوا هەرگیزاو هەرگیز کۆن نابێت. ئایا ئۆکسجین چی لە لاستیك ئەکات؟؟.. بەڵێ ئۆکسجین، لاستیك ئۆکسیدێن دەکات لەو شوێنانەی کە بەندی [١٨] جوتی تیادا هەیە. شیانی باسە لاستیکی سروشتی ولاستیکی دەستکردیش بە هەمیشەیی بەندیکی تێرنەکراوی کاربۆن = کاربۆن لەهەمو یەکەکانی زنجیرەکانیاندا هەیە. ئەنجائۆکسجین بەتایبەتی هێرش دەباتە سەر ئەو بەندانەو ئۆکسیدێنیان دەکات یەکەجار (پایرۆکسید) پێك دێت لەپاشان پایرۆکسیدەکە شی دەبێتەوەو زنجیرەی گەردەکان دەبچرێنێت ولە ئەنجامدا گەردی بچوکی ئەلدەهایدو کیتون دروست دەبن. بۆیەکە باشترین رێگا بۆ پاریزگاری کردنی لاستیك لەرزین شاردنەوەیەتی لەشوێنێکی تاریك وبێ ئۆکسجین چونکە تیشکی رۆژ وگەرمی هەردوکیان هان کارلێکەکیمیایی یەکانی فەوتاندنی لاستیکەکە ئەدەن.

جگە لەو مادانەی باسمان کردن هەندێك جار مادەی تریش تێکەڵ بەلاستیك دەکەن بۆ مەبەستی تایبەتی.

## ٢- پیشەسازی لاستیکی دەستکرد

لێرەدا مادە بنچینەیی یەکەی لاستیك لەکارگەدا دروست دەکرێت لەوانە:

١) پۆلی ئایسوپرین. **Poly 1sprene**

٢) پۆلی بیوتەدایین. **Poly Butadceine**

٣) پۆلی کلۆرۆپرین. **Poly Cloroprene**

٤) لاستیکی ( SBR ). **Styrene butadiene Rubber**

٥) لاستیکی نایتریل. **Nitrile**

هەروەکوگوتمان لەپێشەوە مادەی سەرەکی لاستیك لەسەرەتای ئەم سەدەیە هاتە کایەوە. بۆ وێنە پۆلی ئایسۆپرین لە پەلمەرینی غازی ئایسۆپرین جێ بەجێ کرا هەروەها لاستیکی دووەم واتە پۆلی بیوتەدایین لە پەلمەرینی غازی بیوتەدایین هاتە دی. بەلام لە پەنجاکان بەدواوە چەشنێکی نوێ لە لاستیك دروست کرا. ئەم چەشنە بە پەلمەرینی هاوبەشی واتە (البلمة المشترکة) نێوان دوو مۆنۆمیر **Monomer** ئامانج دران بۆوێنە = لاستیکی **SBR** لە پەلمەرینی هاوبەشی نێوان ستایرین ومادەی بیوتە دایین پێك دێت.

ستایرین + بیوتەدایین <u>پەلمەرین</u> لاستیکی **SBR**

٢٥٪ ٧٥٪

هێڵکاری خوارەوە بەشێوەیەکی کورت قۆناغەکانی کارلێکی کیمیایی وپەلمەرینی ستایرین و بیوتەدایین و دروست کردنی لاستیکی ( **SBR** ) نیشان ئەدات:-




شیانی باسە ناتوانین لێرەدا زۆر قوڵ بینەوە بەلام پێویستە بڵێین بیوتەدایین و سالیریت بەلەمرین دەکرێن بەتەکنۆلۆجیای پەلمەرینی (خلت) واتە (البلمدة الغرویە) لە ناو ئاو. لەم جۆرە گەردی زۆر درێژ پێك دێن. هەروەها پێویستە لێرەدا بڵێن: دوو جۆر لاستیك ی ( **SBR** ) لەبازاردا هەیە:-

١) لاستيكى ( SBR )ى ساردواته : Cold SBR
٢) لاستيكى ( SBR )ى گەرم واته : Hot SBR

جياوازى نێوان لاستيكى ( SBR )ى گەرم و( SBR )ى سارد تەنها پلەى گەرمى ئامادەكردنى پوليمەرەكەيە. بۆ ئامادەكردنى لاستيكى ( SBR ى) سارد پلەى گەرمى كەمتر لە (١٠اص) بەكاردەهێنرێت كەچى بۆ ئامادەكردنى لاستيكى ( SBR )ى سارد زۆر باشترە لە ( SBR )ى گەرم چونكە گەردەكانى درێژ ترموباشترە. لەم چەن ساڵەى دوايى يەدا گۆرانكاريەكيان بەسەر ئامادەكردنى لاستيكى نايتريل Nitrile Rubben ئەنجامدا ئەويش بەتيكەڵ كردنى (ئەكريلۆنايتريل) وبيوتەداياين لەگەڵ ريژەى (٥٪) لەستايرين ئەمجا هەرسێ ئاوێتەكان پوليمەرێن دەكرێن. بەم جۆرە لاستيكێ كى باشتريان هێنايە كايەوە.
لە عيراقى خۆماندا دوو كارگەى لاستيكى ميرى هەيە يەكێكيان لەپارێزگاى ديوانيەيەوئەويتر لە كوفەيە. هەردو كارگەكان لاستيكى خاو دروست ناكەن. بەڵكو لاستيكەكەلە دەرەوە دەكرن چ لاستيكى سروشتى بێت يان لاستيكى دەستكرد ولە كارگەكەدا دەيهارن ومادەكانى ترى تێكەڵ دەكەن و دەيكەن بەتايەوەكو تايەى ديوانيەو بابل.

## لاستيكى كۆن و بەكارهێنراو

بێ كومان بە هەزاران و مليۆنە تايەى سەيارە هەمو ساڵێك فرێ ئەدرێن چونكە كۆن و بێ كەڵك دەبن. ئايا رێگايەك يان تەكنۆلۆجيايەك هەيە بۆ سوود وەرگرتن لە لاستيكى كۆن؟. وەڵامى ئەم پرسيارە بەڵێ!! هەيە وگەلێك لە كومپانياكانى لاستيك ئەم جۆرە لاستيكە كۆنە دەهارێت وچەن گۆرانكاريەكى كيميايى بەسەردا ئەنجام ئەدەن بۆ گۆرانكاريەكى بچوكەكان درێژ تربكەن. لە پاشان بە رێژەيەكى ديارى كراو تێكەڵ بە لاستيكى نوێ دەكرێت و جۆرەها بابەت لە كەلوپەلى لاستيكى لێ دروست دەكرێت شيانى باسە بێت وەكو لاستيكى نوێ. بەلام بۆ دروست كردنى جۆرەها شت وەك خراپ نى يە سەرنجى خوێنەران بۆ وتارەكەمان لەرۆشنبيرى نوێ ژمارە (١٤١) ساڵى ١٩٩٨ رادەكێشين. ئەو گوتارە دەربارەى پلاستيكى كۆن و بەكارهێنراو نوسراوە وگەلێك زانيارى بەسودى تيادا هەيە دەربارەى لاستيك.

## سەرچاوەكان


1. A. Sehmidt and C. Marlies, Prineiples of High polymers — theory and practice, Me Grew Hill Book Comp. 1948.
2. R. N. Shreve, «the Chemical process Imdustries», Me Graw Hill Book Comp. 1956.
3. B. F. Greek, J. Chem. and Ens. News, April 30, page 35, 1984.
4. B. F. Greek, Chem. Ens. News, April 17, 1989.
5. Stinson, Chem. Ens. News, April 15, 1985.
6. B. F. Greek, Chew. Ens. News, March 21, 1988.
7. B. F. Greek, Chew. Ens. News, March 31, 1986.
8. F. Rodriguey, «Prineiples Polymer Systems», Me Graw Hill Bookeo. 1983.


## پەراوێز

(١) لاستيك جۆريكە لەجۆرەكانى (پۆليمەر).
(٢) پيكهاتۆى كيميايى = التركيب الكيميائي.
(٣) تاقيگە = مختبر.
(٤) لاستيكى سروشتى = المطاط الطبيعي.
(٥) شيرەى دار = عصارة الشجره.
(٦) لەراستيدا كولاندنى لاستيك لەگەڵ گوگرد لەم دوايى يەدا روى دا
(٧) دارلاستيك = شجر المطاط. بەلام نەك ئەم دارانەى لە ماڵاندا بەخێو دەكرێن.
(٨) العالم الجديد = أمريكا العالم القديم = ئاسيا.
(٩) بە ئينگليزى (Rub) بەواتا ساين واتە (حك).
(١٠) كومپانياى گوديير بۆ يەكەم جار لەشارى ئەكرۆن سەربە ولايەن ئۆهايۆ دەمەزراو خاوەنەكەى چارلس گوديير زانايەكى كيميا بوو. شارى ئەكرۆن ناسراوە بە مەزنترين فابريقەى لاستيك لەجيهاندا بۆيەكى پێى دەڵێن پاى تەختى لاستيك لەجيهاندا. نوسەرى ئەم لێكۆلينەوەيە لەزانكۆى ئەكرۆن بروانامەى دكتوراى هێناوە ساڵى ١٩٧٠.
(١١) دلۆپاند = قطر.
(١٢) ئايسۆپرين غازە وياساكەى بريتى يە لە.

$$CH^{2}=Ch-CH=CH^{2}$$
$$CH^{3}$$

(١٣) دالاس كارۆثەرس = دۆزينەرى نايلۆنەو دۆزينەرى پۆل ئستەر و دۆزينەرى لاستيكى (لێوپرينە) زانايەكى بليمەتى سى يەكان بوو ويەكێكە لە كۆڵەكەكانى زانستى پۆليمەرى نوێ.
(١٤) كێشى گەردى = الوزن الجزيئي.
(١٥) بلورى = متبلور.
(١٦) ئەم سيفەتەش پێويستى بە شيوەيەكى تايبەتى يە بۆ ئەوەى زنجيرەكان بەئازارى بخولێنەوە.
(١٧) پێكهاتوى لاستيك = تركيب المطاط.
(١٨) پۆليمەر گەرديكى زور درێژە ولەيەكگرتنى صەدەها يەكەى (مۆنومر) پێك ديت. دەيەها وتارم بەكوردى لەگۆڤارى هاوكارى دا دەربارەى پۆليمەر بلاوكردۆتەوە ساڵى ١٩٩٦.
(١٩) تۆركردن = تشابك واتە وەكو تۆر.
(٢٠) مادەى پركەرەوە = المادة المالئه او المحشية.

(٢١) مادەی (چالاك كەر) = واتە المادة المعجلة.
(٢٢) تۆركەم كەرەوە = مقلل التشابك.
(٢٣) مادەی دژ بە ئۆكسیدێن = مانع الاكسدة.
(٢٤) هیمای گەرد = الصیغه الجزیئیة.
(٢٥) ستایرین مادەیەكی شلەو بیوتەداین مادەیەكی غازە.
(٢٦) هەردوكیان غازن وبەرهەمی نەوتن.
(٢٧) پەلەرێن = پلمرة Polymeriyation.
(٢٨) پۆلیمەرێنی سروشتی بەهۆی ئەنزیمی تایبەتی جێ بەجێ دەبێت.
(٢٩) ئەكریلۆنایتریل ئەم هیمایەی هەیە:
(٣٠) دەنلۆپ زانایەكی كیمیا بوو هەمیشە كارگەی تایەی هەبوو.
(٣١) مافی داهێنان = براءة أختراع.
(٣٢) سەرمایەدار = رأس مالی.
(٣٣) ئەكریلات ئیستەری ترشی ئەكریلكن.
(٣٤) پۆلی ئەثیلین باوترین پلاستیكی جیهانەو لەهەمویان هەرزان تری.
(٣٥) ئۆكسیدین = اكسدة.
(٣٦) مەزنترین كومپانیای ئەمەریكاوجیهانە.
(٣٧) پۆلیمەری هاوبەش = پۆلیمر مشترك.
(٣٨) توێنەرە كیمیائی = المذیبات الكیمیائیه.
(٣٩) هیمای كیمیائی ئەم ئاوێتەیە بەم جۆرەیە.
(٤٠) سیلیكون توخێكی تایبەتی یەوهیمای (Si) هەیە.
(٤١) واتە بەرگەی گەرما دەگرێت.
(٤٢) لێرەدا مەخسەد لەپیشەسازی گورانكاری لاستیكی سروشتی بە سروشت دەكات.
(٤٣) لینجی = لزوجه.
(٤٤) مادەی نەرم كەر = ملین.
(٤٥) ماشین = ماكنه.
(٤٦) ئۆكسیدی توتیا.
(٤٧) تیشكێكی بەهێزە واتە ناوتیشكی رۆژدا كەمێكی هەیە.
(٤٨) بەندی جوت = آصرة مزدوجه.
(٤٩) المادة الأساسیة.
(٥٠) البلمرة الغرویة.
(٥١) گەرد = جزئیة.

## ملخص البحث

# المطاط الطبيعي والصناعي وطرق تصنيعهما

الدكتور ذنون پيريادی/ كلية العلوم/ جامعة بغداد

المطاط مادة فريدة في صفاتها لا تتوفر في كثير من المواد المعروفة. عرف الأنسان المطاط الطبيعي منذ أقدم العصور حيث أستخرجها من شجر المطاط الذي يكون المطاط في ساقه كسائل أبيض يتصلب عند خروجه الى الجو. وقد عرف الأنسان فيما بعد فائدة أضافة نسبة معينة من الكبريت لأعطاء المطاط صلابة جيدة يجعلها صالحاً لصناعة أطار السيارات. وتدعى تفاعل الكبريت مع المطاط الطبيعي (بالفلكنه).

البحث الحاضر يتناول تاريخ المطاط الطبيعي ومن ثم تحليله في مطلع القرن العشرين ومن ثم تحضير مطاط مشابه للمطاط الطبيعي، كذلك يتناول البحث التطورات التي طرأت على صناعة وتحضير المطاط الصناعي في الثلاثينات وما بعدها.

## دەربارەی نووسەر

- دكتور ذنون پیریادی لە ساڵی ١٩٣٣ لە گوندی علي منصور نزیك بە چەمچەماڵ لە دایك بوە.
- خوێندنی سەرەتایی و ئامادەیی لە كركوك تەواوكردوە.
- بروانامەی B.se لە دار المعلمین عالی بەغدا بە یەكەمی و پلەی (شرف) ساڵی ١٩٥٥ وەرگرتوە.
- بروانامەی M.se لە زانكۆی ئۆكلاهۆمای میری ئەمەریكا ساڵی ١٩٦٧ وەرگرتوە.
- بروانامەی دكتورای Ph.D لە زانكۆی ئەكرۆن لە ئۆهایو ـ ئەمەریكا لە بواری كیمیای ئەندامی و پولیمەردا وەرگرتوە.
- خزمەتی زانكۆی بەغداو سلیمانی كردوە.
- ساڵی (١٩٧٥) لێكۆڵینەوەی زانستی لە زانكۆی ئەریزونا (ئەمەریكا) لەگەڵ پرۆفیسور هۆل كردوە.
- ساڵی (١٩٨١) لێكۆڵینەوەی زانستی لە زانكۆی مشیگان لە گەڵ پرۆفیسوری خوالی خوشبوو ئۆبەربورگەركردوە.
- كتێبی لەچاپ دراوی (١٣) لێكۆڵینەوە (٨٠) وتارو (٢٤٠)، ئەلقەی ئیستگەی كوردی (٢٢٠).. قوتابی ماجستیرو دكتوراه (٢٥).ـ پرۆفیسۆری یەكەمی عیراقە ساڵی (١٩٩٦ ـ ١٩٩٧).
- ناوی لە (موسوعة اعلام العراق في القرن العشرين ـ الجزء (٢) هەیە).
- یەكەم مامۆستایە لە نوسینی ئینسایكلوپیدیایەكی پۆلیمەربەشداری بكات.
- لەو بروایەدایە بەبێ زانست و تەكنۆلۆجیا هیچ میللەتێك بە ئامانج ناگات هەرچەندە ژمارەیان زۆر بێت یان خاوەن سامان بێت.
- ناونیشانی كۆلیجی زانست ـ زانكۆی بەغدا بەشی كیمیا.



# فرمانی تێنەپەڕو تێپەڕو چاوکە(ئەلفیە - أ) پەتێنەپەڕەکان (المطاوعة) لە ڕوانگەی بنیادی (ناوەوە)و (دەرەوە)

# deep srtucture And surface structure (البنية العميقة والسطحية)

د. نسرين فخري

«مەروانە واتای وشە، بەڵکو بروانە بەکار هێنانی»

لەم باسەدا دێینە سەر لایەنێکی گرنگی زمان بە گشتی و، زمانی کوردی بە تایبەتی، لە پاڵ بەراوردی کردن لە نێوانی هەردوو زمانی کوردی و عەرەبیدا، ڕوون کردنەوەی هۆی ئەم بەراوردییە.

ئەوەندەی بزانین و، ئاگادارین، ئەم لایەنە نەکەس بۆی چووە، نەباس کراوە، بە نووسینیش بەرچاو نەکەوتووە، دوور نییە ئەگەر باس کردن و، وتنەوەی - بۆ نازانین - واتا وەك خۆی لەم بۆ ئەوو، لەو بۆ ئەم چۆتە سەر، لە زمانی عەرەبیشدا بەم جۆرە، ئەویش ئەوەندەی ئاگادارین، سەرەڕای گفتوگۆکردن و، پرسینیش لە چەند پسپۆری ناسراوی زمانی عەرەبی، لە زمانزانە عەرەبەکان.

ئەو لایەنەش کە زۆر گرنگەو، بە گرنگی دەزانین و، چەند ساڵێکە، بەڵکو چەندین ساڵە داویە لە خەیاڵ و مێشکم و، سەرنجی ڕاکێشاوم بێ ئەوەی بیخەمە سەر کاغەزو، لە وتارو باسێکدا بڵاوی بکەمەوە، لەبەر هەر هۆیێك بێت، ئەم گوێ نەدانە پێی، بەڵگەی بیر نەکردنەوە و، ورد نەبوونەوە و، لاسایی کردنەوەی یەکترییە، یان هی پێش خۆیانە، بە بێ بە سەردا - چوونەوە، دووریش نییە لە کوردییدا، ئەنجامی کەوتنە ژێر بارو کاری زمانی عەرەبی بێت تارادەیەکی باش و، بە هۆی (ئیعراب و - اعراب وحركات الاعراب)ەوە، چونکە لە عەرەبیشدا ئەم باسی هەر بەو جۆرە هەڵەیە و، سەر پێیە چۆتە سەر، کە هەڵەکە نە لە زاراوەکاندایەو، نە لە دارشتنی جۆر بە جۆری ئەو فرمانانەدایە، لە ڕستەی هەمە چەشنەدا، بەڵکو لە هەڵە چونە، لە تێگەیشتنی ئەو زاراوانەو، ناوەرۆکی ئەو دەر - بڕینانەی ئەم فرمانانە بناغەیانەو، هێشتنەوەیان بەبێ لێکدانەوەیەك بە ڕاستی و ڕوونی بیان خاتە ڕوو و، مافی خۆیانیان بداتێ.

ا لە پێشدا بێینە سەر زاراوەکانی (تێنەپەڕ و تێپەڕ)و بزانین ئایا زاراوەکان لە جێی خۆیاندانین، یان لێڵ و، هەر ئەوەندە دیارن کە باسکراون؟ لە وەڵامدا دەڵێی نەخێر، بەڵکو ئەنجامی سەرپێی و، لە ڕووی واتای ڕواڵەتەکەیەوە، بە هەڵە تێیان گەیشتوون، هەر بە بۆچوونەش لە فرمانی چاوکە (أ) ئەلیفەکان) کە لە عەرەبیدا پێیان دەڵێی (الأفعال المطاوعة)و لە کوردیدا بە (تێنەپەڕ).

وەك ووتمان زاراوەکان وەك زاراوە ڕاستی و، لە جێی خۆیاندان و، وەك کورد دەڵێت: «پڕ بە پێستی خۆیانن» بەڵام لە چەمەکیان نەگەیشتوون و، نەچوونەتە ناوەرۆکیانەوە و، هەوڵی ئەوەیان نەداوە کە هەردوو ناورۆك و، ڕواڵەتی ئەم زاراوانە بە یەك بگەیێنن، بە - ڕوون کردنەوە و، ساغ کردنەوە و، دەرخستنی ئەو ئەنجامە کاتی کاتی گفتو گۆکردن لە بارەیانەوە، یان کاتی باس کردن و ووتنەوەیان بە قوتابیانی

ئەو پلانەی کە ڕوو بە ڕووی ئەم جۆرە باسانە دەبنەوە، واتا لە ڕوانگەی هەردوو بنیادی ناوەوە و دەرەوە - من منظور البنيتين: البنية العميقة - او الداخلية - ، والبنية السطحية - او الخارجية - واتا (deep structure) و (Surface structure) زاراوە ناوە - هەر زاراوەیەك، بەڵام ئەو (ناو)ە نییە کە بۆ نیشانەکردن بەکار دێت - وەك ناوی مرۆڤ و گیانلەبەرو شتی تر) یان بۆ ناسین و ناسینەوەو، جودا کردنەوەی ئەم لەوو ئەو لەم، بەڵکو (زاراوە) ئەو ناوەیە؛ کە دەبێت (پڕ بە پێستی خۆی بێت)و پڕ بە پێستی ئەو ناوەرۆکە بێت، واتا ناوەرۆکی ئەو شتە بێت کە بۆی دانراوە، ڕەنگدانەوە و، وەڵامی تەواوی بێت، چونکە پێوەندییەکی بەتین و پتەو هەیە لە نێوانیاندا و، زاراوەکە ئاوێنەی ناوەرۆك و ڕواڵەتی ئەو شتەیە و، لە وەوە و، لێیەوە هەڵقوڵاوە ئاکەوتۆتە ڕوو.

بە کورتی زاراوەی تێنەپەڕو تێپەڕو (مطاوع) زۆر تەواون، هەر چەندە ئەگەر لە عەرەبیشەوە وەرگیرابن. بەڵام کاتی باس کردن دیوارێکی سەخت بەرزکراوەتەوە لە نێوانی هەردوو بنیادی (ناوەوە)و (دەرەوە)ی و، لە ڕووی تێگەیشتنی زاراوەکەش خۆی، کە ئەو دوو بنیادە یەك دەخات و دەری دەخات کە ئەم بنیادەی دەرەوە (البنية السطحية) ڕووی ئەو دیوی (بنیادی ناوەوە البنية العميقة)یە، لە کاتێکدا بێ گوناه و، بە بێ هیچ لێڵییەك لە یەك ترازێنراون.

دووبارە دەکەمەوە، هۆیەکی گەورە و سەرەکی کەوتنە ژێر باری زمانی عەرەبییە، بێ بیرکردنەوە و لێکدانەوە و، لێکۆڵینەوەیان؛ بە پێی ئەو ڕواڵەتەی هەیەو، هەست کردن و هەڵکشان لە ناوەوە، لەو هۆیەوە، بیرۆکەیەوە؛ کە ئەم ڕواڵەتەی لێوە هەڵقوڵاوە، لەو بنیادە قووڵەوە کە لەم ڕواڵەتەدا ڕەنگ دەداتەوە،

هیچ کارێك بێ بکەر ناکرێت، واتا ڕوو نادات هەروەها دەبێت ئەو کاری بکەرە ڕەنگدانەوەیەکی هەبێت لە کەسێکدا یان شتێکدا.

لە زمانی عەرەبیدا لەبەر ئەوەی - بکەر - (فاعل - مرفوع)و (بەرکار - مفعول بە - منصوب - ە) بە گشتی لە تاکدا - وا بردوویانەتە سەر بە بێ - بیرکردنەوە.

ئەو فرمانەی کە تەنیا لەگەڵ بکەردا دەردەکەوێت و لە عەربیدا (بکەر)ەکە (مرفوع بالضمة)یە، ئەو فرمانە بە (تێنەپەڕ) دادەنرێت کە بەرکار (مفعول بە) نییە و، وەری ناگرێت، نەك پێویستی بە (بەکار)ێك نییە لە دەرەوەی خۆی و، لە هەردوو زمانی عەرەبی و کوردی بەو جۆرە لێك دەدرێنەوە.

بابێینە سەر نموونە بۆ فرمانی تێنەپەڕ - (لازم -

منداڵەکە نوست ـ (نامَ الطفلُ) لە عەرەبیدا دەگوترێت (الطفل فاعل مرفوع وعلامة رفعهِ الضمّة الظاهرة علیٰ آخرهِ)و بەس، لە کوریدا:ـ منداڵەکە بکەرەو بەس.

با بپرسین:ـ فرمانی رووداو لێرەدا چییە؟ (نوستن)ە باشە کێ کارەکەی کرد ـ کاری نوستن؟ منداڵەکە. منداڵەکە (بکەر)ە هیچ کارێك بێ ئەنجام نابێت، واتا کە رووی دا دیارە، کە کراش دیارە (بکەر) هەیە، کە (کار)یش رووی دا، دەبێت ئەو روودانەدیار بێت.

دەپرسین:ـ کاری نوستن کەوت بەسەرکێدا؟ بەسەر منداڵەکەدا. کێ دەڵێت:ـ ئەوەتا نوستووە. کەواتە خۆی (بکەر)و (بەرکار)ە، لە خۆی و بۆ خۆی تە یەکێك خەواندوویەتی و بووە بە (بکەر) تا خۆی ببێت بە (بەرکار)؟ بەڵکو خۆی خۆی خەواندووە ـ واتا ـ نەخەوێنراوە. چۆن خەوت؟ خۆی خەوت. من نەم خەواند.

کەواتە مەبەست لە زاراوەو رستەی تێنەپەڕ ـ بەو فرمانە دەگوترێت کە پێویستی بە کەسێك یان شتێك نییە، تاکو کارەکەی بکەوێتە سەر، واتا هەر وەك خۆی (بکەر)ە، خۆشی (بەرکار)ە، واتا (بەرکار) لە خۆی بەدەر نییە، لە خۆی (تێپەڕ) نابێت و لێی (تێ ناپەڕێت).

ئیتر بەم پێیە دەتوانن هەر فرمانێکی تری لەم جۆرە وەربگرن و لێکی بدەنەوە وەك: کەوتن، هاتن، مردن هتد... هەرچەندە هۆیێك هەیە بۆ روودانی ئەو کارە و، راکێشانی (بکەر) بە دوایدا.

بیرکردنەوە و تەتەڵە کردنی هەر بیرو بیرۆکەیەك لە مێشکدا؛ پێش دەربڕین، دەوری پتەورو تەواوی هەیە؛ لە هەڵبژاردنی ئەو وشانەی کە ئەو مەبەستە دەگەیێنن، هەر وەك کورد خۆی دەڵێت:ـ

ـ (قسە ببێژە، بچێژە، بوێژە) = هەروەها لەگەڵ چۆنێتی رێزبوونیان و دارشتنیان بە پێی یاساکانی هەر زمانە، جا بۆیە لەبن و بنیادەوە؛ بەرەو سەرەوە هەڵکشێن و، ئەو رووەی سەرەوەش لە پێی ئەو ناوو ناوەرۆکە لێك بدەینەوە، واتا ـ ئەو مەبەست و ناوەرۆکە بخەینە روو، هەر وەك گوتمان.

تا ئێستا لە وانەکانی قوتابخانەکاندا ـ چ بە عەرەبی و چ بە کوردی، هەروەها لە پلەکانی باڵادا، هەر لەسەر ئەو رێ و شوێنە کۆنە دەرۆن، واتا تەنیا رووالەتی ئەو دەربڕینانە دەخەنە روو، بە شێوەیەکی سادەو ساکاری ئەوتۆ، کە تارووالەتەکەشی بە لێڵی و ناتەواوی دەمێنێتەوە، لە مێشکی زۆربەی خوێندەواراندا، کە ئۆباڵیان دەکەوێتە ئەستۆی ئەو فێرگەرە شارەزاو پسپۆرانەی کە یان کە سەر دەقی خۆیان ماونەتەوە، یان ئیتر بەوە وازیان لە خۆ ماندوو کردن و، بە سەردا چوونەوەدا هێناون و، لە عاستی خۆیاندا دەقیان گرتووە، کە ئەنجامی هەوڵیان بەو شێوەیە، هەر بۆ مەبەست بردنە سەرە لە کاتێکی تایبەتیدا، دوای ئەوە ئیتر کاریان پێیان نامێنێت ـ لە کاتێکدا (زانست و زانیاری غایەتە، نەك ئامێرە ـ العلم غایة لا وسیلة). جا ئەم هەڵگێرانەوەیە نەك هەر بێ سوودە، بەڵکو کارەساتیشەو، بەرە بەرە زیانی سەر هەڵ دەدات و تەشەنە دەکات.

ئێستا پاش باسکردنی (فرمانی تێنەپەڕ و زاراوەی تێنەپەڕ) بێینە سەر (زاراوە و فرمانی تێپەڕ).

وەك لە باسی (تێنەپەڕ)دا گوتمان ـ فرمان بێ (بکەر) نابێت، (بکەر)یش دەبێت ئەنجامی کارەکەی دیار بێت، تا بزانێت کارەکە کراوە و، بکەر ئەو کارەی ئەنجام داوە.

جا با بزانین (فرمانی تێپەڕ و زاراوەی تێپەڕ یەعنی چی و؟ چ جیاوازییەکی لەگەڵ (فرمانی تێنەپەڕو زاراوەکەیدا) هەیە؟!

بە کورتی ـ لە فرمانی تێنەپەڕدا ـ وەك گوتمان = بکەرو بەرکاریەکی ـ واتا ئەرکی ئەو کارە لە (بکەر) ناچێتە دەرەوە و، ناکەوێتە سەر غەیری خۆی ـ بۆیە پێی دەڵێی (تێنەپەڕ) واتا ـ لە خۆی تێپەڕ نابێت، لە (فرمانی تێپەڕ)دا ـ ئەو (بکەر)ەی کارەکە دەکات، ئەرکی کارەکەی دەکەوێت بەسەر یەکێك یان شتێك لە خۆی بەدەر، واتا ناگەرێتەوە بۆ سەرخۆی و، لە خۆی دەچێتە دەرەوە، جا ئەو شتەی پێوەندی بەکاری بکەرەکەوە هەیە، بەر ئەو کارە دەکەوێت، بۆیە پێی دەگوترێت (بەرکار ـ مفعول بە).

جا بۆچی ـ فرمانی تێنەپەڕ. بەو جۆرەیە و، فرمانی تێپەڕیش بەم جۆرە؟! چونکە ئەمە سروشتیانە، واتا خاسیەت و تایبەتمەندیانە، چونکە ئاوێنەی کۆمەڵی و رەنگدانەوەی سروشتی کۆمەڵ و زمانی، هاتوونەتە کایەوە بۆ پڕ کردنەوەی پێویستییەکانی زمان، کە شان بە شانی پێویستییەکانی کۆمەڵ دێتە کایەوە، بۆ وەڵامدانەوەی هەر هەڵسوکەوتێك لە ژیانیدا.

با ئێستە بێینە سەر نموونە بۆ فرمانی تێپەڕ:ـ

جووتیارەکە زەویەکەی کێڵا، نووسەرەکە باسەکەی نووسی لە رستەی یەکەمدا:ـ فرمان ـکێلان ـ ە ـ کە (تێپەڕ)ە

جووتیار ـ (بکەر)ە، کە کارەکەی (کێڵان) بوو.

زەویەکە ـ بەرکاری ئەو کێڵانە کەوت. کاری بکەر کە (کێڵان) بوو، لە زەویەکەدا دەرکەوت. جووتیار چیی کرد؟ زەویەکەی کێڵا ـ جووتیار خاوەن کارەکەیە یان: (بکەر) چیی کرد؟ زەویەکەی کێڵا؟ بۆ؟ چونکە زەوی ـ نە (عاقل)و نە (گیانلەبەر)ە، تا خۆی خۆی بکێڵێت، خۆی کاری خۆی بکات، دەبێت یەکێك ـ (عاقل) گیانلەبەر بیکات کاتی خۆی و بە پێی پێویستی، بکەر لێرەدا یارمەتیدەرەکەیە، کە بێ گومان بۆ سوودی خۆیەتی.

لە رستەی دووەمدا:ـ فرمان و کار چییە؟ (نووسین)ە، کێ ئەو کاری نووسینەی کرد؟ نووسەرەکی نووسەرەکە چییە؟ (بکەر)ە. (بکەر) چیی نووسی؟ ووتار. بۆ؟ چونکە ئەو نووسینە، واتا ئەو شتەی پێویستی بە دەربڕین هەیە، نەك لە رێی ئاخاوتنەوە، بەڵکو لەرێی تۆمار کردنەوە بە نووسین. نە خۆی لە خۆیەوە دەبێت و، نە خۆشی دەتوانێت خۆی بنووسێت. کەواتە یارمەتیی دەوێت، دەبێت یەکێك بیکات، کە کاریەتی، ئەو یارمەتیدەرە ئەو (بکەر)ەیە کە توانای ئەو کارە و هێنادیی ئەو کارەیە، نەك هەموو (بکەر)ێك. هەر کەسەر کاری خۆی (نان بۆ

نانەواو، گۆشت بۆ قەساب). بە پێچەوانەی فرمانی تێنەپەڕ = (بکەر) خۆی ئیشی خۆی دەکات، واتا ئەو ئیش و کارەی دەبێت بکرێت و (بەرکار)ەکە بکەوێت و ببێت بە (بەرکار) هەر (بکەر)ەکە خۆیەتی و، بارمەتیی ناوێت، کار هی خۆیەتی و ئەنجامیش بۆ خۆیەتی. بەڵام بە پێی پێویستی ژیان و، (دەوران دەوری)و بارو دۆخی هەمە چەشنە، ئەو (بکەر)ە ناچار دەکات، کە یەکێکی کە بچێتە جێی و، ببێت بە (بکەر)و ئەو هەر (بەرکار)ەکە بێت، ئەو کاتە هاومەبەستی تێپەڕی، ئەو فرمانە تێنەپەڕە دێتە کۆڕ، ئەگەر نەبوو، خۆی خۆی لە تێنەپەڕەوە دەگوێزێتەوە سەر (تێپەڕ) بە پێی یاسای زمانەکەی خۆی (منداڵ ـ نەخۆش)ە کە خەوت. (خەوتن)

(منداڵ ـ نەخۆش)ە کە ـ نە خەوت ـ من (منداڵ ـ نەخۆشە)ەکەم خەواند (بکەر) (من)م ـ من (خەوێنەر)م، نەك (خەوتوو).

(منداڵ ـ نەخۆش) (بەکار)ن ـ بەرکاری خەوتن کەوتن ـ کەواتە (خەوێنراو)ن (بکەر) نەخەوت، ئەوانی (خەواند)، کەواتە فرمان (خەواندن)ە نەك (خەوتن)ە.

لەبەر ئەوەی کاری بکەر، لە خۆی دەچێتە دەرەوە، بۆیە لە رستەی سادەدا سێ وشە بەدی دەکرێت: فرمان، بکەر، بەرکار، کە لە کوردیدا دارشتنی بە پێچەوانەی زمانی عەرەبییە: بکەر، بەرکار، فرمان:ـ

حرثَ الفلاحِ الارض ـ جووتیارەکە زەوییەکەی کێڵا.

كَتبَ الكاتبُ البحث ـ نووسەرەکە باسەکەی نووسی.

جا لەبەر ئەوەی زمانی کوردی وەك زمانەکانی بنەماڵەکەی و ئەو خێزانەی دەچێتەوە سەریان، بە پێچەوانەی زمانی عەرەبی، کە (اعراب وحرکات الاعراب)ی هەیەو؛ بەوە لێك دەدەرێتەوە، لە رێگەی جۆری دارشتنەوە؛ واتا رێك خستنی وشەکان لە رستەدا یان جۆری کۆتایی ئەو مەبەستە جیاوازانە بە ئامرازی تایبەتی روون دەبێتەوە، بۆیە دەڵێیی ـ گەر زۆر نا؛ بەڵام تا رادەیەك کەوتۆتە ژێر باری زمانی عەرەبی، چونکە لە عەرەبیدا رستەی تێپەڕ وەك دەزانین لە حاڵەتی تاکدا ـ بۆیە تاکمان هەڵ ـ بژاردووە ـ چونکە روونترو ئاسانترە بۆ ئێرەو، (حرکات)ەکان دیارو ئاشکران ـ بۆ (بکەرە ـ الفاعل ـ الضمة)و (بەرکار ـ المفعول ـ الفتحة)و وەردەگرێت. جا هەر لەو چوار چێوە تەسکەدا، لە چەمەکی (مفهوم) ـ (المتعدّي) تێ دەگەن، واتا (تێپەڕ ـ متعدّي) (بەرکار ـ مفعول) وەردەگرێت و (تێنەپەڕ ـ اللازم)نا. زۆر جار قوتابیی عەرەب ئەگەر (مفعول)ە کە بەو جۆرە، یان راستەو خۆ دیاردنەبوو، تێپەڕ لەتێنەپەڕ جودا ناکەنەوە ـ تاقیکردنەوەی خۆمە لەگەڵیاندا ـ ئێستا با بێینە سەر فرمانی ئەم چاوگە (أ ـ ئەلفی)یانەی کە تێنەپەڕن و (لە عەرەبیدا پێیان دەڵێن ـ الأفعال المطاوعة). (أ)ن ـ واتا ئەو چاوکانەی کە کۆتایی یان بە (ان) دێت، واتا پێش (ن)ی چاوك (أ) هەیە، بۆیەش پێیان دەڵێن (أ)ی.

جا لێرەدا باسی چوار بەشەکەی ترە؛ کەتێنە پەڕن، بەڵام یان (د)ین وەك (مردن)، یان (ت)ین وەك: (کەوتن) یان (و)ین وەك: چوون یان (ی)ین وەك: رزین.

پێش هەموو شتێك هەموو دەزانین و دەبێت باشیش بزانین؛ کە (فرمان بێ بکەر نابێت)

---

هەر لێرەوە با بڕوانینە ئەم کۆمەڵە فرمانانە؛ کە سەرپێیی و بە بێ ـ تێگەیشتن لە زاراوەی (تێنەپەڕ)و فرمانی تێنەپەڕ ـ کە لێرەدا مەبەست (أ)ییەکانە، کە بۆچی وایان پێ دەڵێن؟ ئایا لەبەر ئەوەی (بەرکار ـ مفعول) وەرناگرێت؟ یان لە بەر هۆی تر؟!

بۆ چیش لە عەرەبیدا لە چاوگە تێنەپەڕەکانی تر جودایان دەکەنەوە و پێیان دەڵێن:ـ (الأفعال المطاوعة)؟!

با بێینە سەر نموونە:ـ

ترسان:ـ منداڵەکە ترسا ـ دە ترسێت ـ منداڵەکە ترساوە ـ ترساو خاف الطفلُ ـ الطفل خائف ـ أُخيف بشيء، شتێك ترساندوویەتی ـ ئەم ـ ترساو ـ ە، نەك کەسێکی ترساندووە.

کەوانە ـ ترساو ـ بەرکار ـ ە نەك بکەر.

بەڵام ئەو شتەی لێی ترساوە (عاقل) نییە، (گیانلەبەر) نییە (لا عاقل ولا حي) غير متعمّد.

ئەگەر لە لایەن (عاقل وگیانلەبەر)ەوە بێت:ـ دیارە (بکەر)ە و فرمانەکە تێپەڕ دەبێت و دەبێت بە (ترساندن) ـ ترسێنەر ـ (بکەر)ەو ترسێنراو ـ بەرکارە ـ لێرەدا ـ (ترسێنراو) نییە، (ترساو)ە

منداڵەکە ترسا ـ ترساو ـ ە = فرمان و بەرکار، ئەی کوا بکەر؟!

لێرەدا وەك بڵێی (فرمانەکە بکەر نادیارە) هەر وەك بڵێیی ـ منداڵەکە ترسێنراوە ـ بە چی نازانین؟! شتێکی دیوە و ترساوە، روو بە رووی شتێك بۆتەوەو لێی ـ ترساو ـ ە، هەر وەك بڵێین ـ بەرکار ـ ەکە خۆی بەرەو ئەو (بکەر)ە چووە، یان هاتۆتە رێی، نەك (بکەر)ەکە ئەو کارەی کردووە، ئەمە کاری ـ عاقل و ژیریکی گیانلەبەرە.

منداڵەکە لە پشیلەکە ترسا ـ لە پشیلەکە ترساوە، نەك پشیلەکە ترساندوویەتی ژیرانەو بە ئەنقەست، منداڵەو لە پشیلە دەترسێت. هەر لەبەر ئەم هۆیەش لە عەرەبیدا بەم جۆرە فرمانانە دەڵێن: (الافعال المطاوعة)

ـ با بێینە سەر نموونە:ـ

ترسان:ـ منداڵەکە ترسا ـ دە ترسێت ـ منداڵەکە ترساوە ـ ترساو ـ خاف الطفلُ ـ الطفل خائف ـ أُخيف بشيء، شتێك ترساندوویەتی ئەم ترساوە ـ ، نەك کەسێکی ترساندووە.

کەواتە ـ ترساو ـ بەرکار ـ ە نەك بکەر.

بەڵام ئەو شتەی لێی ترساوە (عاقل) نییە، (گیانلەبەر) نییە (لا عاقل ولا حي) غير متعمّد.

ئەگەر لەلایەن (عاقل وگیانلەبەر)ەوە بێت:ـ دیارە (بکەر)ەو فرمانەکە تێپەڕ دەبێت و دەبێت بە (ترساندن) ـ ترسێنەر ـ (بکەر)ەو ترسێنراو ـ بەرکارە ـ لێرەدا (ترسێنراو)نییە، (ترساو)ە

منداڵەکە ترسا ـ ترساو ـ ە = فرمان و بەرکار؛ ئەی کوا بکەر؟!

لێرەدا وەك بڵێی (فرمانەکە بکەر نادیارە) هەر وەك بڵێین ـ منداڵەکە ترسێنراوە ـ بە چی نازانین؟! شتێکی دیوە و ترساوە، روو بە رووی شتێك بوەتەوە و لێی ـ ترساو ـ ە، هەر وەك بڵێین ـ منداڵەکە ترسێنراوە ـ بە چی نازانین؟! شتێکی دیوە و ترساوە، روو بە رووی شتێك بوەتەوە و لێی ـ ترساو ـ ە، هەر وەك بڵێی ـ بەرکار ـ ەکە خۆی بەرەو ئەو (بکەر)ە چووە، یان هاتوەتە رێی، نەك (بکەر)ەکە ئەو کارەی کردووە؛ کە ئەمە گازی ـ عاقل و وزیریکی گیانلەبەرە.

منداڵەکە لە پشیلەکە ترسا ـ لە پشیلەکە ترساوە، نەك پشیلەکە ترساندوویەتی زیرانەو بە ئەنقەست، تەنها ئەو لە پشیلە دەترسێت." هەر لەبەر ئەم هۆیەش لە عەرەبیدا بەم جۆرە فرمانانە دەڵێن: (الافعال المطاوعة)،

احترق الزرع ـ رەزەکە سووتا ـ الزرع محترقٌ ـ لا خارق ـ مفعول لا فاعل اذن این الفاعل؟! اختنق الحیوان ـ لە رووالەتدا ـ فعل وفاعل ـ فرمان و بکەرە کە لە راستیدا ـ فعل ومفعول ـ ە فرمان و بەرکار ـ ە؛ کەواتە کوا (بکەر ـ فاعل)؟ لێرەدا هۆیەك هەیە دەبێت بە (بکەر)، دەکرێت بە بکەر، دەچێتە شێوەی (بکەر) نەك بە دەستی ئەنقەست، بەناچار بووە.

اختنق الحیوان ـ فعل وفاعل ـ بە رووالەت، فعل ومفعول لە راستیدا. الحیوان مختنق ـ لاخانق ـ مفعول لا فاعل، ئاژەڵەکە خنکا ـ خنکاو ـ ە، ئیتر چۆن و بە چی؟ ئەو هۆی ئەو (خنکاندن)ەیە

کەواتە پێویستە دووبارە لە ئاستی ئەم زاراوە و فرمانانەدا بوەستین وەستانێکی زانستیانە و زانیارانە و ژیرانە و لە مەبەست و بیروکەو ناوەوەی ئەو دەربڕینە بکەین ـ چۆن هات و چۆن دروست بوو و؟ لە چیش؟ تا بەو شێوەیە لە رێگەی ئاخافتنەوە کەوتە روو و، واتا چۆن لەو بنیادی ناوەوە هەڵکشا بەرەو بنیادی دەرەوە؟!.

بۆیەش لە عەرەبیدا ئەم فرمانانە بە گشتی لەسەر (وزن ـ کێش)ی (افتعل)یە ـ اختنق، احترق، یان ـ کێشی :ـ انفعل ـ انکسر ـ شکا، انهدم ـ رووخا هتد. هەر بۆیەش ـ ئەو (بکەر)ە لێرەدا کە بەرووالەت (بکەر)ەو لە راستیدا خۆی (بەرکار)ە ـ (مجازاً ـ فاعل ـ بکەر ـ ە)، هەر وەك بڵێن جێگەی بکەری گرتوەتەوە، وەك شووشەکە شکێنراو ـ ە. وانکسر الزجاج من کسره؟ کیف انکسر (لا ندري ـ رأیناهُ منکسراً (منکسِر ـ مُنفعل) أي ـ مکسورٌ ـ مفعول ـ لا ـ (کاسر ـ فاعل). هەروەك بڵێین: کسرَ الزجاجُ ـ الفاعل مجهول ـ بکەرنادیارە.

## ئەنجام

بە کورتی مەبەست لە (زاراوە و فرمانی تێنەپەڕ) نەك تەنیا بکەری دەوێت و پێویستی بە (بەرکار)نیە، بەڵکو بەر کارەکە هەر خۆی (بکەر)ەکەیە، بۆیە کە پێی دەگوترێت (تێنەپەڕ) واتا (بەکار) لە خۆی ناچێتە دەرەوەو، لە خۆی تێ ناپەڕێت، واتا ئەرك و ئەنجامی کارەکە دەگەڕێتەوە سەر (بکەر) خۆی؛ واتا لە خۆیەوە بۆ خۆی.

ئەم کۆمەڵە فرمانە تێنەپەڕانە ئەمەیە سروشتیان، بۆ جێبەجێ کردنی ئەم مەبەست و ئەنجامەش هاتوونەتە کایەوە، چونکە زمان ئاوێنەی کۆمەڵە و شان بە شانی ئەو پێویستیانەی دێتە کایەوە؛ ئەوانیش بەو پێیە بۆی دێنە کۆڕی بەکار هێنان و کارکردن.

لەم کۆمەڵەدا ـ ئەم فرمانانە، لە بکەرەوە بۆ بکەرە، لە خۆیەوە بۆ خۆیەتی، بەڵێ ـ بکەر ـ دەڵێت :ـ هی خۆمەو بۆ خۆمەوتەواو، خۆم دەی کەم و بەخۆمی دەکەم و؛ بۆ خۆمی دەکەم و؛ خۆم دەتوانم بیکەم بێ یارمەتیدان.

بەڵام ئەگەر هاتو ئەو کارە بۆ (بکەر)ە کە خۆی نەکرا، لەبەر هەر هۆیەك بێت؛ ـ کە کاتی ڕاڤەکردنی هەمە چەشنەکان؛ لە نموونەی جۆر بە جۆردا روون دەبێتەوە ـ ئەوا لێرەدا (بکەر)ی یاریدەر دێتە کایەوە، کە بکەری راستەقینە و راستەو خۆی کارەکەیە؛ فرمانە بەکار هاتووەکەیە، بەڵام چۆن و لەگەڵ چیدا؟..

دیارە لەگەڵ فرمانێك کە خۆی (تێپەڕ) بێت، یان توانای بوونی هەبێت بە (تێپەڕ) ـ کە یەکەمیان بنچینەو دووەمیان دروستکراو ـ هەر وەها توانای ئەو کارەی هەبێت بۆیە دەی کات، جاوەك ووتمان؛ بەشێك لەم فرمانە تێپەڕانە هەرخۆیان بە تێپەڕی دروست بوون و هاتوونەتە کایەوە، دووبارە وەك پێویستیەکی کۆمەڵایەتی؛ وەك نووسین ـ نەك تەنیا لە کوردیدا لە هەموو زمانێکی زیندوودا ـ بۆ نموونە پێویستی بە نووسینێ باسێك هەیە، خۆی بۆ خۆی و لە خۆیەوە نانووسرێت، چونکە نەخاوەن عەقڵەو نەگیانلەبەرە، کەواتە دەبێت یەکێکی عاقڵ گیانلەبەر بیکات، کە توانای ئەو کارەی هەبێت، واتا توانای بەسەریدا بشکێنێت، نەك هەر کەسێك؛ کەواتە کە دەڵێین (تێپەڕ)؛ واتا ئەو (بکەر)ەی کارە دەکات و فرمانەکە دەهێنێتە کایەوە؛ راستە سوودیشی بۆ خۆیەتی بە هەر جۆرێك بێت، لەوانەیە ئەنجامی کارەکەش هەر بۆ خۆی بگەڕێتەوە، بەڵام ئەنجامی کارەکە نەك لە (بکەر)ە کە خۆیدا دەردەکەوێت؛ بەڵکو لەشتێك لە دەرەوەی خۆیدا، بۆیە پێی دەڵێن (تێپەڕ).

لە تێپەڕدا ـ (بکەر) خاوەن عەقڵە و ژیرە، دەزانێت چی دەکات و؛ بۆ دەی کات و؛ کەی دەی کات؛ لە (تێنەپەڕ)دا ـ جگە لە (ئەلفیەکان) ـ راستە (بکەروبەرکار)یەکی، بەڵام دووبارە (هۆ)یەکی لە توانا بەدەر، رێکەوت، دەسی ئەنقەستی تێدا نیە ـ کاری ژیان و سروشتی ژیانە ـ کە دەتوانین بڵێین ئەو هۆیە جۆرە بکەرێکە ئەم (بکەر)ەی کە (بەرکار)یشە؛ رادەکێشێت بۆ ئەو (بکەر)یە. فلان مرد، چۆن مرد و بەچی؟ بە نەخۆشی. لە داخا مرد (بەعەزرەتەوە سەری نایەوە). نوست. بۆ نوست ـ وەختی نوستنیەتی، لە هیلاکیدا نوست. لێرەدا نەخۆشی، داخ، عەزرەت، هیلاکی بە بکەر لە قەڵەم دەدرێن کە (هۆ)ن و دەبنە هۆی بوونی ئەو بکەرە بەرکارە؛ ئەو (بکەر)ەی لە پشت ئەمەوەیە؛ نە عاقڵەو نەگیانلەبەرە، بەڵکو دیاردە و پێویستیەکی سروشتیە؛ رایان دەکێشێت بەرەو خۆی.

جاریش هەیە ئەو فرمانە تێنەپەرانە ـ کە خۆیان ـ بکەرو بەرکارن ـ هاوەبەستی تێپەریان نیەو، پێویستیش پێیان لە جێی خۆیەتی؛ دووبارە بارودۆخی ژیان و سروشتی کۆمەڵگا دەیان خوڵقێنێت و، زمانیش هاوشانیانە »

بۆ نموونە: کەوتن ـ تێنەپەر، خستن (تێپەرو هاوەبەست لە واتادا هەروەها (هاتن و هێنان)، چوون و بردن هتد . .

بەڵام (خەوتن)و (نوستن) هەردووك هاو مەبەستی بەڵام تێنەپەرن . نمداڵەکە خەوت، (نوست)، خۆی لە خۆیەوە خەوت، خەوی هات و خەوت، خەتووە (نوستووە).

منداڵەکە نەخەوت، ناتوێت، خەوی نایێت، ئازاری هەیە، قیقی گرتووە، خەوی زڕاوە، یان (زڕابوو). من دەی خەوێنم، من منداڵەکەم خەواند. من (بکەر)م و (خەوێنەر)م، منداڵەکە (بەرکار)ە، (خەوێنراو)ە، لە رێی بکەرەوە خەوتن ـ تن + اندن = خەواندن .= تێپەر .

ئەمە دەربارەی تێنەپەری (د)ی و (ت)ی و (و)ی و (ی)یی.

بەڵام فرمان هەیە روو دەدات بەبێ ئەوەی (بکەر) دەسەڵاتی هەبێت تێیدا، چونکی دووبارە نەزێر و عاقڵەو، نەگیانلەبەرە، نەخۆی بەرەو ئەو شتە دەچێت کە دەبێت بەبەرکار، چونکە بەر ئەنجامی ئەو کارە دەکەوێت و، هەر وەك بڵێن ـ بە پێی خۆی بۆی چووە، ناچاری رای کێشاوە بۆی، (قەزاو قەدەر پاڵی ناوە پێیەوە بەرەو ئەو چارە نووسە. بۆیەش لە عەرەبیدا پێیان دەڵێن:

(الأفعال المطاوعة) تێنەپەر (مجازاً ـ کە لە راستیدا (بەرکار)ەو، هەروەك بڵێیت (بکەر) نادیارە. رەزەکە سووتا ـ احترق الزرع ـ رەز سووتاوە ـ بەرکارە، الزرع مُحترق لا محروق. هەروەك بڵێیت ـ رەزەکە ـ سووتێنرا ـ أُحرِق الزرع (کێ)و (من) سووتاندی ـ أحرقه ـ نادیار . مجهول.

## ملخص البحث

# مفهوم الأفعال اللازمة والمتعدية والمطاوعة من منظور البنيتين السطحية والعميقة

أ.د. نسرين فخري/ كلية التربية/ ابن رشد/ جامعة بغداد

هذا البحث يفتح نافذة على مفاهيم الأفعال اللازمة، والأفعال المتعدّية، والأفعال التي تسمّى بالمطاوعة، وعبرها الى الفواعل (جمع فاعل)، والمفاعيل (جمع المفعول به)، بكونها إنعكاسات لحياة المجتمع وأفراده المتحكم أو المحكوم بالظروف التي تحيط به.

فالفعل اللازم ـ سُمّيَ لازماً، ليس معناه الذي يكتفي بالفاعل ويلتزم به لعدم حاجته الى مفعول، بل لعدم حاجتِهِ الى مفعول خارجي، وإلّا فدون الفعل لا فاعل، ودون تأثير الفاعل على شيء ما، لأمر ... لأنّ الفاعل هو المفعول به، الذي يقع موقع الفاعل اعرابا :ـ فعلى سبيل المثال لا الحصر :ـ جملة (نام الطفل)، من نام؟ الطفلُ على من وقع تأثير الفعل؟ على الطفل. أي سلطان النوم هو السبب في إنامته. وهكذا . . .

فما سمعتُ دارساً يسأل: لقائم بالفعل هو الفاعل، لا الذي يقع عليه وقع الفعل بفعل فاعل، فكيف وماذا وراء هذه البُنية السطحية، وهذا الاعراب؟!

والمتعدّي كما هو معروف يسمّى فعلاً متعدياً ـ يتجاوز ويتعدّى الفاعل لعدم اكتفائِهِ به، ولحاجته الى مفعول خارجي يقع عليه فعل الفاعل.

امّا الفعل المطاوع (كما يسمّىٰ بالعربية)، يقابله في الكردية كل فعل (لازم ـ ظاهراً ـ مصدره ينتهي بـ(أ) يسبق (ن) المصدر) حيث يقع الفعل فيه موقع المبني للمجهول، مثلاً: احتراق (سووتان)، احترق ـ سووتا، احترق الزرع ـ رەزەکە سووتا ـ ما الذي احترق؟ الزرعُ، الذي اصابهُ الحرق هو الزرع، اذن (الزرع محترقٌ)، فهو ليس بـ(حارق ـ فاعل)، ولا هو بـ(مفعولٍ صريح) فكأننا نقول (أُحرِقَ) بسببِ ما (والذي يقع موقع الفاعل). ايضاً لم أسمع دارساً يسأل ايضاً: لماذا؟ ولماذا (المطاوع)؟ لأن الذي يقع تحت تأثيره ينقادُ اليه، وهذا (المسبب ـ السبب) لايسحبه اليه بارادته، إنه قضاء الله، وكل الاسباب منه تعالى.

فكل هذه الظواهر اللغوية ماهي إلا انعكاسات لمفردات الحياة اليومية المتقلبة، وما توالدها إلا إستجابات لافرازاتها المختلفة.

فالحكم على الظواهر ـ أية ظاهرة ـ ومنها الافعال على اختلاف انواعها، والجمل الفعلية من الوجه ومن بنيتها السطحية، يُولّد ارباكاً عند الدارس، ينتهي به الى تعقّده من مادة القواعد (التي هي العمود الفقري للّغة وسلامتها وسلامة تعبير الناطق بها) ـ فيردد ما يُلعَن ـ وسيلةَ لا غاية يجتاز به مبتغاه.

أي نعم . . إنّ البنية السطحية الوجه الظاهر للبنية العميقة، لكنّها خلاصة منقحة، مركزّة، تطوي في ثناياها سرّ وصوله هذا السطح، إذن فلا بُد من البحث من خلالها في أعماق النفس البشرية وما تطوي، وما في مستودع ذهنه من خزين، ثم فهمها وأستيعابها والصعود بها تدريجياً الى البنية السطحيّة (Serface structure) كيف انبنت؟! وكيف استوعبت مفهوم تلك البنية العميقة (deep structure)!! وبالعكس الغوص تدريجياً من السطح نحو العمق.

فدراسات القدماء ـ على الاغلب كانت وصفيّة تحليلية، فبدلاً من تسهيل هذا السبيل ورفده بالجديد، واذا بها انحسرت الى حد التقوقع في دائرة (التلقين والتقليد) والطوفان على السطح.

بأختصار فالبحث يلقي الضوء الى حدّ ما، وقدر المستطاع على المذكور أعلاه، بالأدلة والامثلة، أملاً في نهجٍ علمي جديد يُسهّل الصعب، لايُصعب السهل، ويحل العقد، لايَزيده تعقيدا.

# چەند لاپەڕەیەك لە خەباتی گەلی کورد لە ئیران

د. فوزیة صابر محمد
زانکۆی مستنصریة
و/ ڕۆشنبیری نوێ

بابەتی مەسەلەی نەتەوەیی لە ئیران یەکێکە لەو بابەتە ئاڵۆزو هەستیارانەی کە سەرنجێکی زۆری لێکۆڵەرەوان ڕادەکێشێ چونکە کاریگەری یەکی زۆر دەکاتە سەر باری سیاسی ئیران بەو پێ یە کە یەکێکە لەو بنەمایانەی کە لە کاتی دانانی بڕیاری سیاسی دا بەبایەخەوە بەرچاوەدەخرێت. ئەوەیش گرنگی و زیندوویی ی بابەتەکە زیاتر دەکا ئەو دژایەتی یە ئاشکرایەیە کە لە نێوان داخوازی یەکانی نەتەوە غەیرە فارسەکانی ئیران و لە نێوان سیاسەتی چەوساندنەوەی نەتەوەیی و ڕۆرکارانەی ڕژێمە بەرودواکانی ئەوێ دا دەبینرێت. ئەمەش بوەتە هۆی لاسەنگی سەختی هاوکێشەی سیاسی نێوان هەردوو لایەکە بە شێوەیەکی گشتی و شوێنەوارێکی پڕ لە مەترسی بە مێژووی نوێی ئیرانەوە جێ دەهێلێ.

شایانی باسە، زۆر بەندی ئەم لێکۆڵینەوەیەش دەربارەی مەسەلەی نەتەوەیی لە ئیران کەم تا زۆر بە باڵای هەندی کۆمەڵانی خەڵکی تری رۆژهەڵاتی ناوەراست دا دەبڕێ چونکە ئەم کۆمەڵانەش لە ڕووی بینای مێژوویی و سیاسی یەوە لە چەند ڕوویکەوە لە یەك دەکەنەوە بەتایبەتی کە گشتیان هەندێ کەمینەی زمان و ڕەگەزو ئاینی جیاوازیان تێدا هەیە، کە بەردەوام دیاردەی نائارامی سیاسی لەو کۆمەڵانەدا لەبەر هەندێ هۆی دیارو بابەتی پێك دەهێنن.

## پاش خانێکی مێژوویی:

بەر لە کۆتاهاتنی شەری یەکەمی گیتی، بزوتنەوەی نیشتمانی ئیران کە خەباتی گەلە غەیرە فارسەکانی سەرەتیری بوو، تووشی قۆناغێکی گرنگ و بن برکەر هات، پێشینەکانی لە گیلان و مازەندەران و ئەزربێجان و کوردستان دا بە گوڕ خۆی نواند. جا بەربڵاویی بزوتنەوەکەو کاریگەری یەکانی لە ناوخۆو دەرەوەی وڵات، شان بە شان هەڵوێستی دەوڵەتە گەورەکان و دەست وەردانیان لە کاروباری ئیران، سەردەستەی ئەو هۆیانە بوون کە دەرفەتیان بۆ ڕەزاخانی سەربازی مازەندەرانی ڕێك خست تا بەبازێك خۆی بگەیەنێتە سەر کورسیی حوکمڕانی و لەمەولاش بەرەبابی شاهانەی پەهلەوی لە ئیران دابمەزرێنێت.

ڕەزاخان بە چەند ساڵێك پێش هاتنە سەر تەختی ئێجگار توندوتیژو دڵرەقانە بزوتنەوەو ڕاپەرینە شۆڕشگێرەکانی نەتەوە نافارسەکانی دامرکاندەوە، ئەنجامەکانی ئەم سیاسەتەش لەگەڵ ئەو ڕووداوو کارەساتانەدا دەرکەوتن کە دوای داگیرکردنی ئیران لەلایەن بەریتانیاو سۆڤیەتەوە لە ئابی ساڵی ١٩٤١دا بە هۆی پێوەندیی توندو تۆڵی ڕەزاشا بە ئەڵمانیای نازی یەوە، وەکورەشەبا هەڵیان کرد[1].

داگیرکردنە هاوبەشەکە لە ٣ی ئابی ١٩٤١دا دەستی پێ کردو تا ساڵی ١٩٤٦ درێژەی کێشا، ئیران لە سایەی داگیرکاری دا بەسێ ناوچە دابەش بوو، ناوچەی دەسەڵاتی بەریتانیا لە باشوورو ناوچەی دەسەڵاتی یەکیەتی سۆڤیەتی لە پێنج پارێزگەکانی باکووردا؛ ئەزربێجان. گیلان، مازەندەران، ئەستراباد و خوراسان (جگە لە مەشهەد).. ناوەراستیش کە بریتی بوو لە شارەکانی تاران، ئەسفەهان و مەشهەد بە دەست حکومەتی ناوەندی یەوە ما[2].

ئەو چەند ڕۆژەکەمانەی دوای داگیرکردنی ئیران لە لایەن هاوپەیمانەکانەوە بەڵگەی نەتوانی و مایەپووچی و گۆشەگیریی سیاسەتی ڕژێمەکەی بۆ ڕەزاشا دەرخست. پاش مۆرکردنی بەڵگەنامەی واز لە تەختی شاهانە هێنانی ڕەزاشا محەممەد ڕەزاشای پەهلەوی لە شانزەی ئەیلولی ساڵی ١٩٤١دا هاتە سەرتەخت، ئەگەرچی تارادەیەك سەردەمی نوێی شا لە سەردەمی باوکی جودابوو، ئەمەش لەبەر چەند هۆیەکی دەرەوە بوو، کەوا هەوڵی دا هەستی نارەزایی و کینەبەریی ئیران یەکان

هۆی سیاسەتی نارەوای شای دەرکراوەوە کەم بکاتەوە، ئەوەبوو لە رۆژی تاج لە سەرنانی دا بەڵێنی دا چی لە دەست بێ بیکات بۆ راست کردنەوی خۆی گوتەنی (ئەو خەتایانەی تووشی گەل هاتووە چ بە تاك و چ بە کۆمەڵ)[3] ئەگەرچی شا بەڵێنی بە گشت داو پەیمانی دا کە ئاسوودەیی و یەکسانی هەموو رۆڵەکانی وڵات دابین بکات، بەڵام چ گۆرانێکی بەرهەست بەسەر ئەوسیاسەتە چەوتەی باوکی لەگەڵ گەلانی نافارس دا پەیرەوی دەکردنەهات، سەرەرای کاریگەریی مەترسیداری ئەو سیاسەتە لە قووڵکردنی هەست وسۆزی کینەو دوژمنایەتیی رەوا لە نێو کوردو ئازەری و عەرەبەکان و هی تردا.

ئەوسا باری خراپی ئابووری و بوونی هێزەکانی داگیرکەر لە خاکی ئێران بوونە هۆیەکی سەرباری تر بۆ بزووتنەوەی گەلانی نافارس. هەر لەم چوارچێوەیەش دا گەلی کورد لە ساڵانی شەری دووەمی جیهانی دا دەستی دا بزوتنەوە لە چوارچێوەیەکی تازەبووەوەدا کە دروشمەکانی لەگەڵ وەستانی شەرەکە زیاتر گەشەیان کرد.

## بووژانەوەی بزوتنەوەی نەتەوەیی هەڵکشانی شەپۆلی نوێی دیموکراتی:

ئەو بارەی لە کاتی شەری دووەمی گێتی دا لە کوردستانی ئێران هاتە پێشەوە دەرفەتی بۆ جووڵانەوەی سیاسیی کورد رەخساند، بەڵام باری کوردستان جۆرە تایبەتی یەکی هەبوو، کە لەو کاتەدا ئەزربێجان لە لایەن هێزەکانی سۆڤیەتەوە داگیرکرابوو، بەشی باکووری کوردستان واتە ئەو ناوچەیەی لە سەرووی مەهابادەوە تاسنووری یەکیەتیی سۆڤیەتی جاران درێژدەبێتەوە کەوتە ژێر دەسەڵاتی سۆڤیەت، هەر لەو کاتیشدا بەشی باشووری کوردستان واتە لە کرماشانەوە تا دەگاتە سنە (سەنەندوج) لە بەردەستە هێزەکانی ئینگلیزدابوو، کەچی ناوچەی ناوەراستی کوردستان بەشاری مەهابادیشەوە کە بە پایتەختێکی ناوچەیی دادەنرا لەژێر دەسەڵاتداریی شای ئێران بوو لە تاران. . بەم جۆرە مەهاباد لەچاو شارەکانی دیکەی کوردستاندا بارێکی جوداوازی هەبوو، ئەمەو چەند هۆیەکی بابەتیی تر وایان لەو شارەکرد کە لە بزوتنەوەی خەباتی نەتەوەیی کورددا دەورێکی تایبەتی وەربگرێت[4].

وەدانیشتوانە لەچاو ناوچەکانی دیکەدا توانایەکی گەورەتریان دەستگیربێت[5]. شوێنەواری ئەمەش یەکسەر پاش شەری دووەمی گێتی دیارکەوت.

بارو دۆخی رۆژگاری شەرەکەو کەم بوونەوەی دەسەڵاتی حوکمی تاران زەمینەی بۆ جووڵانەوەی عەشیرەتانی خۆش کرد کەوا پاشەکشێی سوپای ئێران و هەڵقەنانی لە بنکەکانی لە کوردستان، هەروەها راکردنی ژمارەیەکی زۆری سەربازانی ئێرانی لە ئوردووگاکانی سوپاوە، وایان کرد رۆڵەکانی عەشایری کورد چەك و فیشەکێکی زۆریان دەست بکەوێت[6]. هێزە داگیرکەرەکانی سوڤیەتیش لە ئاسمانەوە پەخشنامەیان بە زمانی کوردی بڵاودەکردوو خەڵکیان هان دەدا لە نوێنەرانی دەسەڵاتداریی مەرکەزی خۆیان رزگاربکەن. بۆیە خەڵك کەوتنە خۆیان بۆ راوەدوونانی کاربەدەستان و هێزەکانی دەوڵەت و هەر جندرمەو ئەفسەرێکی دەوڵەتیان وەچەنگ کەوتبا چەکیان دەکردن[7] هەروەها رێ بە ئاغەو سەرەك هۆزانی کوردی ناوبەندیخانەو دەستبەسەری دوورەوڵات درابگەرێنەوە ماڵی خۆیان. ئەمانەش داوایان لە حکوومەت کرد ئەو زەوی و زارانەیان پێ بدرێتەوە کە لە سەردەی شای پێشوودا لێ یان زەوت کرابوو وەتوڵەشیان بۆ بژمێردرێت، وەئەو بەرپرسە دەوڵەتیانەی بوونە هۆی ئەو کارەساتانە سزابدرێن، لە دوایشدا پایەو پلەی کارگێریی جارانی خۆیان وەربگرنەوە[8]. بەندیخانەبوو هۆی پایەی پایەنی گەورە بۆیان لەناو کۆمەڵدا[9].

نووسەرێك لای وایە ئەو بارودۆخانەو لەناوچوونی دەسەڵاتداریی مەرکەزی وایان کرد کەو دکوردەکان وابزانن مافی قانوونی ئەوەیان هەیە بە خۆیان حوکمی خۆیان بکەن)[10]. بە تایبەتی کە جێگرەکەی رەزاشا چ هەنگاوێکی بەرچاوی وای هەڵ نەهێنا ئاسەواری سیاسەتی زۆروستەمی رەزا شای باوکی بەرامبەر بە عەشیرەتانی کورد کەم بکاتەوە، بۆیە ئەمانە چوونە سەنگەری دوژمنانی حکومەتی ئێران و لە تەنشت بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد لەو چەند ساڵە کەمەی کە محمد رەزاشا هاتە سەر تەختی پەهلەوی ریزیان بەست[11].

چەند رۆژێك پاش داگیرکردنی ئێران لە لایەن هاوپەیمانانەوە عەشایەری کوردی ناوچەی (بانە)ی نزیك سنووری عیراق بە سەرکردایەتیی حەمە رەشید خانی سەرەك عەشیرەتی یونس خانی دەستیان داچەك و راپەرین. هەر کە هێزەکانی سوپای ئێران ناوچەکەیان جێ هێشت، حەمەرەشیدخان لەگەڵ عەشیرەتە کوردە هاوپەیمانەکانی پشت ئەستوور بەو دە هەزار تفەنگەی لە بارەگاو سەربازگاکانی سوپای ئێران لە ناوچەکەدا دەستی کەوت هێرشی بردو پاش شەرێکی دوورۆژی شاری (بانە)ی گرت[12].

هەر لەو کاتەشدا عەشیرەتانی دی پەلاماری شاری (مەریوان)یان داو گرتیان. زۆری پێ نەچوو شارگەلی: پاوە، نەوسوود، سەردەشت، شان بە شانی سەقزو بانەو مەریوان کەوتنە ژێر دەستەلاتی پتەوی حەمە رەشید خان[13].

لەشکری ئێران کەوتە خۆی بۆ گێرانەوەی دەسەلات لەو ناوچانەدا، پاش ئەوەی شاری سەقزی بە فرۆکە بۆمباران کرد توانی ئەو شارە داگیربکاتەوەو هێزەکانی حەمەرەشید خان ناچاربوون بۆ ماوەی بیست میل بەرەو باکووری سەقز بکشێنەدواوە. پاشان لەشکری تاران پەلاماری شاری بانەی دا، بەڵام نەیتوانی لە دەست دوژمنانی دەربهێنێ، هێزی کورد گەمارۆیان دا بۆ هەڵاتن ناچاریان کرد پاش ئەوەی ژمارەیەکی زۆر سەربازیان لێ بەدیل گرتن. . ئەمەش بە تایبەتی دوای

ئەوەی عەشیرەتەکانی نزیك سنووری عیراق لە بانەو خورخورە پشتگیریان کردن[١٤].

شۆرشگێران ئەمجا بەرەو(سنە) کەوتنەرێ تا رزگاری بکەن بەلام هێزی ئینگلیز نەیان هێشت لە دەوروبەری شار بەولاوە بەرەوسنە بچن[١٥]، چونکە لەوە دەترسان رێی هاتوچۆیان بکەوێتە مەترسی، لە لایەکی تریشەوە ئەو سەرکەوتنانەی شۆرشگێرانی کوردی ئێران و ئەو داخوازییانەی داوایان دەکرد بە جارێ دەنگیان دایەوە، نەك هەر لەناو خاکی ئێران دا بەلکو لە کوردستانی عیراقیشدا، بەتایبەتی دوای ئەوەی هێزی شێخ مەحمودی حەفید[١٦] پەلاماری هێزەکانی ئێرانی داو ماوەی پەنجامیل لە سنور بەرەوژوورچوو[١٧].

ئەوەی زیاتر ترسی ئینگلیزەکانی تۆخترکرد ئەوەبوو کە حەمەرەشیدخان نوێنەرێکی خۆی ناردە سەفارەتخانەی بەریتانیا لە بەغداو پێشنیازی کرد بۆ دامەزراندنی بەرێوەبەریتی یەکی سەربەخۆی کوردی لە کوردستانی ئێران بەریتانیاکان یاریدەی بدەن. وەلامی سەفارەتخانەش نەخێر بوو، بەلکو تێ یان گەیاند کە بەرژەوەندی مەسەلەی کورد لە تێك گەیشتن و رێك کەوتن دایە لەگەل حکومەتی ئێران، ئەگەر، وابێت ئەوا حکومەتی لەندەن ئامادەیە یاریدەی بدات ئەمەش بە هاندانی ئێرانیەکان بۆ گرتنی هەلوێستێکی نەرمونیان[١٨]. بەرپرسانی سەفارەتخانەش بەلێنیان دا کەوا هێزەکانی ئینگلیز دژی حەرشیدخان هەلوێست پیشان نادەن ئەگەر هاتو هاوکاریی لەکەل بەریتانی یەکان بکات و توخنی هێزەکانیان نەکەوێت لە ئێراندا. حەمەرەشید خان پێشنیارەکەی بەریتانیای رەت کردەوەو بریاری دا لەگەل حکومەتی ئێران رێك نەکەوێت[١٩]. بەم جۆرە حەمە رەشیدخان تا دوا دوای سالی ١٩٤٤ بوو بە تاکە سەرداری ناوچەکە لە بانەوە هەتا سەردەشت و بەرێوەبەرێتی یەکی کوردی لە جیاتی بەرێوەبەرێتی ئێرانی لێ دامەزراند[٢٠].

ئەم راپەرینەی کوردە کارێکی زۆری کردە سەر سیاسەتی ناوەخۆی ئیران و بووە هۆی راستەوخۆی سەرهەلدانی چەند رووداوێکی گرنگە لە گۆرەپانی ئەوسای ئێراندا، بە نموونە خۆپێشاندانە بەناوبانگەکەی تاران کە بەراپەرینی (نان)[٢١] ناودارەو لە هەشتی کانونی یەکەمی سالی ١٩٤٢دا روویدا. ئەم راپەرینەش یەکێکە لەو هۆ گرنگانەی کە وەزارەتی «محمد علي فروغی» یان رووخاند[٢٢].

جوولانەوەی کورد هەر لەو ناوچەیەی نێوان بانەو سەردەشت دا قەتیس نەبوو بەلکو بۆ چەند ناوچەیەکی کوردنشینی تریش تەشەنەی کرد. کەوا لەوکاتەدا سەرۆکی عەشیرەتی ناسراوی شکاك عەمەرخانی شەریفی کەوەختی خۆی یەکێك بوو لە هاورێیانی ئیسماعیل ئاغای شکاکی سەرداری کوردی بە ناودەنگە کە بە(سمکۆ) ناودار بوو[٢٣] تازە لە بەندیخانە رزگاری بیوو، لەحکومەت راپەری و دەسەلاتی خۆی بەسەر ناوچەیێکی کەلە نێوان شاەئابادو ماکۆ درێژبووەتەو داسەپاندو سەربەخۆیی راگەیاند، سوپایەکی بیست هەزار کەسی دروست کردو زور لە ئاغاو سەرۆك عەشیرەتەکانی ناوچەکە دووی کەوتن[٢٤] لە نیسانی سالی ١٩٤٢شدا لە رەزائیەو ورمێ ئاژاوە پەیدابوو پاش ئەوەی (پاریزگار)ی ناوچەکە رایگەیاند کە کوردەکان دەبێ چەك بکرێن و ئازمری یەکانی دانیشتووی ئەوێ چەکداربکرێن لەبەر ئەوە کوردەکان نارەزاییان پێشان داو عەشایەر بەرەو دەوروپشتی ورمێ کشان، هێلی تەلەفۆنیان پچراندو شارەکەیان گەمارۆدا، ئیتر پارێزگار تێی تەقاند رەوییە تاران. ئەوسا قونسولی سۆڤیەتی ناچاربوو خۆی لە کاروبارەکە بگەیەنێ، بە پەلە چووە ورمێ. لەوێ ئاغەو سەرۆکانی عەشیرەتە کوردەکانی دیت کە یاداشتنامەیەکیان پێشکەش کرد داوای مافی ئازادیی نەتەوەیی خۆیان تێدا کرد، کەوادەبێ لە دایەرەکانی حکوومەت لە ناوچەکەدا نوێنەریان هەبێت و دەبێ زمانی کوردی لە قوتابخانەکاندا بخوێندرێت. وەلامی قونسولی سۆڤیەتی ئەوە بوو کە کورد ئازادن چەك هەل بگرن و لەسەر ئەوەش رێك کەوتن کە هێزەکانی جندرمەی ئێران لە دەوروبەری ناوچەکە بکشێنەوە[٢٥].

هەر ئەم هەلوێستەی سۆڤیەتە بووە هۆیەك کە هەر دوو حکومەتی ئیران و تورکیا شان بە شانی بەریتانیا سۆڤیەت بەوە تاوانبار بکەن کە لەگەل کوردەکان لەبنەوە سازاوەو ئاسوودەیی ناوچەکە دەشوێنێ[٢٦]. لە کرماشانیش کە هێلی هاتوچۆی بەریتانیا هەر بیست میلێك لە شارەکەوە زیاتر دوور نەبوو عەشایەری کوردی ئەوێ راست بوونەوەو بەشەو پەلاماری سەربازگەکانی حکومەتیان دەدا لە رۆژهەلاتی شاردا[٢٧]. بەلام لە شنۆ بزوتنەوەی کورد شێوەیەکی قوولتری هەبوو، چونکە شنۆ نزیك مەهابادی بنکەی بزوتنەوەی نەتەوەیی کوردەو لەسەر رۆخی سنووری ئەزەربێجان و کارەساتە شۆرشگێرییەکانی بوو، لەمەش گرنگتر، دەستەی رۆشنبیرانی ئێرە سەنگێکی تایبەتی و کاریگەیان هەبوو، چاکترین بەلگەش بۆ کاریگەریی ئەو هۆیانە لە بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد سروشتی ئەو هەنگاوانەبوو کە لە ناوچەکەدا هاویشترا کەوا بە تەواوی لە تاران سەربەخۆبوو. ئەوەبوو بریاردرا هەلبژاردنی هەموو کاربەدەستانی کارگێربکرێت هەر لە فەرمانرەواوەتا دەگاتە موختار گوندی، هەموو دانیشتوانی ناوچەکەش بە چاوپۆشین لە پایەی عەشیرەتی یان پلەی کۆمەلایەتی مافی دەنگە دانیان درایە. هەروەها لە سەر کیسەی داهاتی ناوچەیی بریاردرا زنجیرە چاکەکاری یەکی کۆمەلی و رۆشنبیری دەست پێ بکەن. گرنگترین هەنگاویش سووك کردنی باری قورسی خەرج و باجی حکوومەت و دەرەبەگەکان بوو لە سەر شانی هاوولاتیان. ئەم هەنگاوانە سەرنجی نووسەرێکی بیانی یان راکێشاوە کە لەو دەمەدا سەر لە ناوچەکاداوەو لە نزیکەوە سەیری پەرەسەندنی کاروباری کردووە. کە لەمەولا نووسیویەتی: «لە شنۆ لە هەموو جێ یەك زیاتر هەست بە کرداری دیموکراتی لە بزوتنەوەی کوردا دەکرێت»[٢٨].

دەسەلاتدارانی تاران هەرچەند کردو کۆشان نەیانتوانی خۆیان بەسەر ناوچەکانی تری کوردەواری دا بسەپێنن بەلکو بە پێچەوانەوە هاوولاتە

کوردەکان زۆرکەم دەنا توانیویانە دژ بە ئارەزووی دەسەڵاتدارانی تاران ناوچەکان بگرنە دەست خۆیان. لە دوادوای ساڵی ۱۹٤۳ شدا دانیشتوانی ناوچەی موکریان توانیان صدری قاضی کە کەسێکی نیشتمانپەوەری ناسراوبوو کە لە دوارۆژیشدا لە کاروباری کوردستاندا دەورێکی گەورەی دەبێت. . توانیان لە هەڵبژاردنی خولی چواردەمینی پەرلەمانی ئێران بە نوێنەری خۆیان هەڵبژێرن، سەرەڕای ئەو هەوڵ و تەقە لایانەی حکوومەت دای بۆ ڕێ گرتن لە هەڵبژاردنی[29] دانیشتوانی شاری مەهابادیش ملکەچی فەرمانڕەوای ئەمیر ئەسعەدی سەرەك عەشیرەتی دیبۆکری نەبوون کە حکوومەتی تاران دایناوبوو، جا بەرەبەرە دەسەڵات کەوتە دەست دانیشتوانی شار[30] هەر کە ساڵی ۹٤٤ خەریکی تەواوبوون بوو هاوولاتانی مەهاباد توانیان پاشماوەی جەندرمەی ئێرانی لە شار دەربکەن و «گەل بە دەستی خۆی حوکمی ناوچەکە بکات»[31] وەکو قاسملو گوتوویە.

پەرەسەندنی کاروبار بەم جۆرەو لەبەر هەندێ هۆی تریش تاران دەستی دایە سیاسەتێکی دوولایەنی بۆ لەغاوکردنی بزوتنەوەی شۆرشگێری کوردستان لەلایەکەوە کە دڵی هەندێ سەردار عەشیرەتی کوردی بەلای خۆیدا ڕادەکێشاو دەیکردن بە فەرمانڕەوای ناوچەکانیان هەروەکو چۆن علی أعظمی زەنگەنەی نازناو «أمیر کل استندار»ی بە فەرمانڕەوای ولایەتی پێنجەمی کرماشان دانا کە خەڵکەکەی ئەوی پێی یان خۆش بوو لە لایەکی تریشەوە مەترەقی لە هەندێ سەروك عەشیرەتی دیکە هەڵگرت تا بێنە ژێربار[32] هەروەکو چۆن لە هاوینی ساڵی ۱۹٤٤ پانزدە سەرەکی کوردی لە ناوچەی ڕەزائیە خستەزیندان هەروەها کەوتە وەشاندنی تۆوی دووبەرەکی لە نێوان سەردارانی کورد لەو ناوچانەدا کە سەربەخۆن بۆ ئەوەی یەك ڕیز نەوەستن[33].

لەگەڵ ئەوەشدا حکومەتی ئێران تەقەلای هەرە زۆری دژی حەمەرەشیدخان تەرخان کرد کە بە درێژایی ساڵانی شەڕ بیووە درکێك لە کەلەکەی حوکمڕانیی ئێران ڕادەچوو. بۆیە لە تشرینی یەکەمی ساڵی ۱۹٤٤ هێزێکی گەورەی بەرەو ناوچەی بانەو سەردەشت ئاژۆت، سەرەڕای هەندێ سەرکەوتنی هەڵمەتەکە لە سەرەتادا بەڵام هێزی حەمە ڕەشیدخان مەردانە لێ یان هاتنەدەست پاشەکشێ یان پێ کردن و زەرەرو زیانێکی زۆریان لێ دان و جەنرال ئەمینی ی سەرکردەی هەڵمەتەکەش لە شەڕدا کوژرا. بۆیە حکومەت ناچاربوو پەنا بەرێتە بەر وتوویژ بە واسیتەی ئینگلیزەکان کە ئامادەیی خۆیان بۆ ناوبژی کردن پیشان دا[34].

ئەفسەری سیاسی بەریتانیا لە کرماشانەوە چووە سەقزو سەرۆکایەتیی وتوویژی نێوان هەردوو لای کرد لەئەنجامدا حکومەتی ئێران ڕازی بوو کە حەمەرەشید خان بە فەرمانڕەوای ناوچەی نێوان بانە سەردەشت دانێت و چەك و جبەخانەی خۆشی لەدەست خوی دا بنێت و هێزەکانی ئێران لە دەرەوەی ناوچەی فەرمانڕوایی ئەودا بێ[35]

بەڵام ئەم ڕیکەوتننامەیە ڕێی لە هەوڵ و تەقەلای تاران نەگرت بۆ داگیرکردنەوەی ناوچەکە، ئیتر لە بنەوە کەوتە داونانەوەو پیلان ڕێك خستن، لەمەشدا توانی هەندێ سەرەك عەشیرەتی بەهێزو دوژمنی حەمەرەشیدخان بە وینەی علی خانی حبیبی و محمود ئاغا بۆ لای خۆی رابکێشێت ئەمانیش کەوتنە شەرفرۆشتن بە هێزەکانی حەمە ڕەشیدخان کە مۆرکردنی ڕیکەوتننامەکە زۆری پێ نەچووبوو! بە پشت و پەنای ڕەتلێك لە سوپای ئێران توانیان هێزەکانی حەمە ڕەشید خان بیەزێنن، کەوا ناچاربوو بکشێتەوە چیاکانی نزیك سنووری عیراق لە دوایشیدا ناچاربوو لە سنوور ئاودیو بێت[36] ئەگەرچی ساڵی ۱۹٤٥ خۆی و دووسەد سواری چەکدار لە عیراقەوە گەڕایەوە کوردستانی ئێران بەڵام نەیتوانی ئەو ناوچانەی کە جاران لە ژێر دەستی دابوو بیانگرێتەوە پاش چەند مانگێك هە ئەو ساڵە لە کاتی ڕووداوە گەرمەکانی شاری مەهاباددا دوای کۆتاهاتنی شەڕی دووەمی جیهان سەرلەنوێ حەمەرەشیدخان ناوی کەوتەوە ناو ناوان[37].

خەباتی گەلی کورد لە ئێران لەو چەند ساڵە کەمەی پاش شەڕی دووەمی جیهان گۆڕینێکی جۆرەکیی بە خۆیەوە دیت لە ئەنجامی ئەو دەورە نوێ یەی کە دەستەی ڕۆشنبیرانی کورد بینیان. کە هەوڵیان دا جڵەوی کاروبار لە دەست ئاغاو دەرەبەگ و کۆنە خوازان دەربهێنن، بەڵێ ئەوەش وا دەرچوو کاتێ کە ڕێکخستنێکی سیاسیی تازەیان لە ١٦ی ئەیلوولی ساڵی ۱۹٤۲دا بە ناوی «کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد» دامەزراند ڕێکخراوەکەش بە «کۆمەڵە» یان بە «ژێ. کاف» ناسرا.

سەرەڕای چەندو چۆنی چۆنیەتی دامەزراندنی کۆمەڵەکە بە تایبەتی دەربارەی ئەو کاریگەرییەی کە کوردانی عیراق هەیان بوو بە تایبەتی حیزبی (هیوا) کە ئەندامانی پێوەندییان بە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەوە هەبوو، هەروەها دەوری حیزبی «توودە»ش لە پەیدابوونی کۆمەڵەدا[38]. بەڵام ئەوەی جێی ناکۆکی نی یە، پەیدابوونی کۆمەڵە ئاسۆی تازەی لە بەردەم خەباتی ڕزگاریخوازیی کورد لە ئێران دا کردەوە بە تایبەتیش کە پێکهاتنەکەی جۆرێکی تازە بوو لەچاو بزوتنەوەی نەتەوەیی کوردا کە وەکو جاران باوبوو جڵەوی سەرکردایەتیی ئەدرایە دەست شێخێك یان ئاغایەك یان دەرەبەگێك[39].

بنکەی کۆمەڵە جگە لە ڕۆشنبیران لە کۆمەڵانی خەڵکی شارو گوندان بە تایبەتی جوتیاران کە کۆمەڵە بایەخێکی تایبەتی پێدان پێك هاتبوو[40].

کۆمەڵە یەکەمین ڕێکخراوێکی سیاسیی کورد بوو کە ڕەخنەی ڕژێمی دەرەبەگی گرت سەروکە خوێن مژەکانی عەشایەری ڕسواکردو خیانەتی بەشێکی لەگەڵ دوژمن سازاودا لەوان ئەتك کرد[41].

پاش ماوەیەکی کەم کۆمەڵە گۆڤارێکی بە ناوی «نیشتمان» دەرکرد کە بەزمانی کوردی ولەچاپخانەکانی تەبریزچاپ دەکرا[42].

ناوی نیشتمان[43] بە پیتی لاتینی دەنووسراو لەناو هەتاوێکی خڕیشدا J.K و لە دەوری هەتاوەکەشدا چەند ئایەتێکی قورئان. دەنووسراو لە ژووروی سەربەگ دەنووسرا بژی کوردو کوردستان و سەرۆك و «هیوا». وێنەی صلاح الدینی ئەیوبیش لە سەر بەرگی زوربەی

ژمارەکاندا هەبوو گۆڤارەکە کە رووی دەمی دەکردە خوێندەوار بە وتەی «برای کورد» دەستی پێ دەکردو داوای لێدەکرد رووبکاتە زانست و خەبات لە پێناو رزگاربوون و کوردەکانی هان دەدا یەك بگرن و «بۆ گەیشتنە ئامانج خەبات بکەن»[11].

کۆمەڵە لە ماوەیەکی کەم بە ناو خەڵکدا بڵاوبووەوەو ژمارەیەکی زۆر ئەندامی پەیداکرد کەوا هەر لەمەهاباد بە تەنێ لە ماوەی شەش مانگدا ژمارەی ئەندامانی گەیشتە سەدئەندام[15] لە هاوینی ساڵی ۱۹٤۳ دا کۆمەڵە توانی رێکخستنەکانی خۆی لە جۆراوجۆر ناوچەی ئێران دابمەزرێنێت بە تایبەتی پاش ئەوەی هەندێ لە خاوەن موڵك و سەرەك لیبرالیەکانی عەشایر هاتنە ناوی یەوە دەنگ و سەدای کۆمەڵە هەتا پەرییەوە ئەو ناوچانەش کە لە ژێر دەسەڵاتی بەریتانیا یان ئەو ناوچانەی هێزی حکوومەتی یان تێدا بوو[16].

ئەوەی مایەی سەرنجە، کۆمەڵە ساڵی ۱۹٤۳ دەستەیەکی تازەی سەرکردایەتی هەڵبژارد کە نوێنەرانی خاوەن موڵك و عەشایەرانی کوردی تێدابوو[17]. بەڵام خاڵی وەرچەرخانی گرنگ لە چاو کۆمەڵەدا ئەوەبوو کە توانی قاضی محمدي کەسێتی ی ناسراو لە دوادوای ساڵی ۱۹٤٤دا بێنێتە ناو ریزەکانی یەوە.

قاضی محمد ساڵی ۱۹۰۰ لە بنەماڵەیەکی بەقەدری بە زانین و خواناسی بە ناوبانگی مەهاباد لە دایك بووە، رۆشنبیرێکی ناسراو بوو، جگە لە زمانی کوردی، فارسی و عەرەبیشی دەزانی، پاشان فێری زمانەی ئینگلیزی و رووسی و تورکی بووە، سەریشی لە فەرەنساوی و ئەڵمانی دەردەچوو. لەسەر دەمی لاوی دا لە بەرەنگاریی هێزەکانی داگیرکەری عوسمانی، ساڵی ۱۹۱۵، لەمەهاباد بەشداری کردوە، بیروباوەری دیموکراتی کە پاش شۆرشی دەستووری لە ئێراندا بڵاوبووەوە کاری تێ کردووە. هەندێ سەرچاوەش وای پیشا دەدەن کە لە ساڵانی شەری یەکەمی گێتی دا پێوەندیی بە شانە بەلشەفیکە نهێنی یەکانەوە کردووە.

قاضی محمد بوو بە (مدیری معارف) لە مەهاباد هەوڵێکی بێ وچانی دا بۆ کردنەوەی قوتابخانەو برەوپێدانی خوێندن[18م4].

قاضی محمد کە رەزاشا وازی لە کورسیی عەرش هێنا کەوتە جموجووڵ و گەران بەناو عەشایەری موکریان دا. دوا دوای ساڵی ۱۹٤۱ ژمارەیەکی باش سەرەك عەشیرەتانی لە مەهاباد کۆکردەوەو بۆ یەکگرتن و یەك رایی بانگی کردن، ساڵی پاشتریش کۆنگرەیەکی بەست سەرۆکە لیبرالیەکانی عەشیرەت و رۆشنبیرانی شۆرشگێری پێکەوە کۆکردەوە[19].

بوونە ئەندامی قاضی محمد لە کۆمەڵەو پاشان هەڵبژاردنی بە پێشەوای کۆمەڵە خاڵێکی ئێجگار گرنگ لە لێکدانەوەی سروشتی ئەو هێزانەی خەباتی گەلی کوردیان لە کاتی ساڵانی شەری دووەمی گێتی و پاش شەرەکەش دا دەبزوواند روون دەکاتەوە. لەو ساڵانەدا کورد دوو شەپۆل دەبینێناو دەبیرد، یەکێکیان سەرکردایەتیەکی تقلیدی کە کەسانی بیر رووناکیان لەگەڵ دابوو. شەپۆلی دووەم ئەنتیجلنسیایەکی راپەریوی بە تەمای جڵەوگیریی سەرکردایەتی. لەبەر چەند هۆیەك کە پێوەندییان بە بنیاتی کۆمەڵایەتی و ئابووری و کارلێکیانەوە لە کۆمەڵی کوردەزاری دا هەیە شەپۆلی یەکەم خۆی سەپاند بەم جۆرە هەڵبژاردنی قاضی محمد بە پێشەوای کۆمەڵە بە دەنگەوە هاتنێکی سروشتکردی واقیعی هاوسەنگیی هێزەکانی ناو خەباتی رزگاریخوازی کوردی ئێرانی ئەو رۆژە بوو.

پاش ئەوەی کۆمەڵە کەوتە چالاکیی ئاشکرا، قاضی محمد دوو جار سەری لە تاران داو دیدەنیی شای کرد، لەم دیدەنیانەشدا قاضی محمد داخوازی یەکانی گەلی کوردی پێشکەش بە شاکردو وەکو خۆی گوتوویەتی داوای لە شاکردووە لە باتی ناردنی تۆپ و تانك دژی کورد بایەخ بە کاروباری رۆشنبیری و لەش دروستیی کوردان بدات[20].

بەڵام هەڵوێستی گوێ نەدان و ملهوریی شا بەرامبەر بە داخوازی و مافەکانی کورد، شان بە شانی گورجی ی رەوتی قەوماوەکانی ئەزربێجانی دراوسێ و چەند فاکتەرێکی بابەتیی تر، لەگەڵ وەستانی شەری دووەمی گێتی وایان کرد رووداوەکان لە کوردستاندا رێرەوێکی تازە بگرنەبەر، کاتێك کە کۆماری مەهاباد هاتە کایەوە کە حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران کە درێژەکێشانی رەوای کۆمەڵە بوو وەلە ۱٦ی ئابی ۱۹٤٥دا دامەزرابوو رایگەیاند.

## ئەنجامی دوایی:

داگیرکردنی ئێران لە لایەن بەریتانیاو سۆڤیەتەوە بووە هۆی رووخانی دکتاتوریەتی رەزاشاو هاتنە سەر تەختی محمد رضا پەهلەویی و کورەکەی. ئەگەرچی سەردەمی شای تازە تارادەیەك لە گەلێ روو لە سەردەمی باوکی جیاوازبوو، بەڵام ئەم ئەنجامی فاکتەری دەرەوە بوو، بۆیە گۆرانەکە دروشمێکی (فوقی)هەبوو لەوانە نەبوو کە کار لە شێوازی حوکمرانی ئەوسا بکات مەگەر لە هەندێ هێڵی ناسەرەکی دا.

ئەگەرچی رووداوەکانی شەری دووەمی گێتی و ئەنجامەکانی ئەم شەرە ئاسەواری لەسەر گشت لایەنێك لە ئێراندا بەجێ هێشت بەڵام ئەم ئاسەوارانە بە تایبەتی سەختی باری ئابووری و زۆرداریی دەسەڵاتداری و بەرەڵلایی فەرمانبەرانی وەبەحوکمی چەند هۆیەکی بابەتی دیاریش، ئەمانە لە هەرێمە نافارسەکاندا بە تایبەتی کوردستان مۆرکێکی جوداو تایبەتیان وەرگرت. لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە سیاسەتی دەمارگیریی نەتەوەیی کە شای تازە بەرامبەر بە کورد پەیرەوی کرد بە درێژیی ساڵانی شەری دووەمی گێتی چ گۆرینێکی بە سەردا نەهات. بێ گومان سروشتی یە ئەگەر ئەم سیاسەتی کورت بینە قینێکی رەوا لە دەروونی کورد پەیدابکات و بۆ راپەرین پاڵیان پێوە بنێ. ئیتر بەم جۆرە کوردستان لە ساڵانی شەرەکەدا تووشی ژانێکی شۆرشگێرانەی گرنگ هات و بزوتنەوەی کوردی ئێران پێی نایە قوناغێکی تازەوەو لە چوارچێوەیەکی نوێ بووەوەو پەرەسەندنێکی بەردەوام دا بوو.

ئەگەرچی بزوتنەوەکە لە راستی دا سنووری هەڵچوونی شۆرشگێرانەی تێ نەپەڕاند کە وەکو وەڵامێکی رەوابووە بۆ ناهەقی و کردارە بەدەکانی رژێمی پەهلەوی کە هەوڵی لەناوبردنی بوون و وجودی نەتەوەییان دەدا. بزوتنەوەکە هەروەها ئەو چوارچێوە ئەیدیۆلۆجی و رێکخستنەی نەبوو کە هەردووکیان پێویستن بۆ ئەوەی بیخەنە رێی راستی جووڵانەوەی کۆمەڵ. لە لایەکی تریشەوە بزوتنەوەکە لە ساڵانی شەڕدا لە ئاستێکی نزمدابوو، دەستێوەردانی نێودەوڵەتی و ئەو هەلومەرجەی رەگەڵی کەوتبوو خۆیان بەشێوەی رەگەزێکی کاریگەری بنبڕکەر لە بابەتەکەدا سەپاند.

لەگەڵ ئەوەشدا خەباتی کورد بە فیرۆنەچوو.. هەر کە شەڕکە کۆتایی هات سەرلەنوێ کەوتەوە بزوتنەوە ئەم جارە لە چوارچێوەیەکی قووڵ و بەربڵاوتردا بۆ ئەوەی خەباتیان، شان بە شانی گەلانی تری ئێران، لە ئاوەرۆیەکی جۆرەکی تازەداتێك بکاتەوە، ئەمەش لە رووداوە بە جۆشەکانی کوردستاندا پاش شەڕوەستان یەکسەر خۆی نواند.

## سەرچاوەوپەراوێز:


١ - نصيف جاسم الاحبابي، العلاقات بين ايران والمانيا النازية ٣٣ - ١٩٤٥ رسالة ماجستير، كلية الآداب، جامعة بغداد، ١٩٨٩.

٢ - G - Lenczowski, Russia and the west in Iran, Ithaca, 1941, O,70.

٣ - الاحوال (جريدة)، بغداد، ١٩ ايلول ١٩٤١.

٤ - عبدالرحمن قاسملو، چل ساڵ خەبات لە پێناوی ئازادی، کورتەیەك لە مێژووی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، بەرگی یەکەم، چاپی دووهەم، بێ، ١٩٨٨، ل٢٧.

٥ - عبدالهادي كريم سلمان، ايران في سنوات الحرب العالمية الثانية، البصرة، ١٩٨٦، ص١١٥.

٦ - حامد محمود عيسى علي المشكلة الكردية في الشرق الاوسط منذ بدايتها حتى سنة ١٩٩١، بورسعيد، ١٩٩٢، ص٣٩٥.

٧ - صلاح ابراهيم النقشبندي، المجتمع الكوردي في كوردستان ايران، دراسة اجتماعية سياسية، رسالة ماجستير، معهد الدراسات الاسيوية والافريقية، الجامعة المستنصرية، بغداد، ١٩٨٨، ص٩٨.

٨ - W. Eagleton, the Lurdirh Republic of 1946, London, New york, torrto, 1963, -.I 4.

٩ - O.I. Jigalina, Natsionulnya, divijenic Kurdor Irana, 1918 - 1947, Moscva, 1988, P. 101.

١٠ - Quotcal in: E. Ballance, OP. cit, P. 40.

١١ - Ligalina, op. cit., pp. 104 - 5.

١٢ - Hassan Arta, Under Five Shahs, London, 1964, Eagleton, op. cit., p. 23.

١٣ - فائزة عباس، جذور الفكر القومي في ايران، رسالة ماجستير، كلية العلوم السياسية، جامعة بغداد، ١٩٩٥، ص٧٦؛ طاهر البكاء، التطورلت الداخلية في ايران ١٩٤١ - ١٩٥١، رسالة دكتوراه، كلية الآداب، جامعة بغداد، ١٩٩٠، ص١٣٦.

١٤ - Arfa, op. cit., p. 68; Eagletan, op. cit, p. 22.

١٥ - سەرچاوەی پێشوو.

١٦ - شێخ محمود ئەودەمە خۆی بە مەلیکی کوردستانی عیراق ناوناو ئەوسا دوژمنایەتی کی گەورەی لەگەڵ ئینگلیزدا هەبوو.

١٧ - فائزة عباس، سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٧.

١٨ - سەرچاوەی ناوبراو.

١٩ - لە سەرچاوەکەی پێشووەوە وەرگیراوە.

٢٠ - هـ.س، ل ٧٨؛ Eagleton, op. cit., p. 23

٢١ - لە ١٩٤٢/١/٨ خۆپێشاندانی توندو تیژ روویدا، خەڵکەکە روویان کردە پەرلەمان و هەندێ کەلوپەلی مەجلیسیان شکاند. هەروەها روویان کردە ماڵی سەرەك وەزیران و زۆر ئوتومبیلی حکومەت و بینایان لە شەقامەکانی پایتەخت تێك شکاند لە رقی باری خراپی ئابووری. دەسەڵاتداران بەزەحمەت و پاش کوشتنی ژمارەیەکی زۆری خۆپێشاندەران ئەنجا توانیان دەست بەسەر وەزعەکەدا بگرن.

٢٢ - R. Ramazani, Iran's Foreign Policy 1941-1973, Virginia, 1975, P. 54.

٢٣ - سەرهەڵدانی سمکو دەگەرێتەوە ساڵانی پێش شەڕی یەکەمی جیهانی بەڵام بە کۆتاهاتنی شەڕەکە بزوتنەوەکەی مۆرکێکی کاریگەرتری بزوتنەوەکەی تا کوشتنی لە ١٩٣٠دا بەردەوام بوو. بۆ زیادە زانین بروانە.

احمد شريفي، عشاير شكاك و شرح زندگى آنها بەرهبری اسماعيل آنها سمكو، تهران، ١٣٤٨. حەسەنی ئەرفەع، کردها، لندن، ١٩٤٤، ل ٦٠ - ٦٢.

٢٤ - طاهر البكاء، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٣٨.

٢٥ - فائزة عباس، س. پ، ل ٧٧ - ٧٨.

٢٦ - هـ. ل ٧٨.

٢٧ - هـ. س.

٢٨ - Tigalina, op. cit, pp, I09 - I0

٢٩ - M. S. Ivanov, Novereysha, Istoria Irana, Moscva, 1965, p. 88.

٣٠ - Arpa, op. cit, pp. 62 - 3.

٣١ - عبدالرحمن قاسملو، كوردستان و كورد. لێکۆلینەوەیەک سیاسی و ئابووری، وەرگێر عبدالله حسن زادە، بێ، ١٩٧٣، ل ١٩٩١.

٣٢ ـ د. ك. و، الوحدة الوثائقية، ملفات البلاط الملكي، الملف ٧٤٦، الوثيقة ٤، ص٢٦.

٣٣ ـ طاهر البكاء، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٤٢.

٣٤ ـ Tigalina, op. cit,p. 70.

٣٥ ـ Arfa, op. cit. p 23., Jigalina, op. cit., P. 107

٣٦ ـ Ballance, op. cit. p. 43

٣٧ ـ بۆ زیادەزانین بڕوانە:

کریس کوچێرا، نەتەوەی کورد لە سەردەمی نۆزدەوبیستدا، حەرەکەی نەتەوایەتی کورد، وەرگێراوی محمد ربانی، چاپی دووەم، تاران، ١٣٦٨، ل ١٧٥، ٢٩٢.

مسعود البارزاني، البارزانيون والحركة الكردية، ثورة بارزان ١٩٤٣ ـ ١٩٤٥، بغداد، ١٩٨٦، ص ٤٨.

هەروەها: «Kurdskaya Diijenic V nov. ayai Noreidhee Vremia» Moscva, 1987, p. 177 Eagleton, op. cit. p. 33.

٣٨ ـ عبدالرحمن قاسملو، چل ساڵ خەبات ـ ل ٢٨.

٣٩ ـ جلال الطالباني، كوردستان والحركة القومية الكردية، ط٢، بيروت، ١٩٧١، ل ١٢٥ كمال مظهر احمد، دراسات في تاريخ ايران الحديث والمعاصر، بغداد، ١٩٨٥، ل ٢٥٨.

٤٠ ـ جلال الطالباني، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢٦.

٤١ ـ کەمال مەزهەر ئەحمەد، تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسی کوردیدا، بەغدا، ١٩٧٨، ل ٨٠ ـ ٨١.

٤٢ ـ تەنیا نۆ ژمارەی لێ دەرچووە.

٤٣ ـ فائزة عباس ـ س. پ. ل ٩١ ـ ٩٢.

٤٤ ـ Eagleton, op. cit, p. 34.

٤٥ ـ Ibid;

٤٦ ـ كمال مظهر احمد. س. پ. ل ٢٥٨.

٤٧ ـ Ghassomlou, op. cit., p. 17

٤٨ ـ بۆ زیادەزانین دەربارەی ژیانی بڕوانە:

کریس کوچێر، سەرچاوەی ناوبراو، ل ٢٧٧ ـ ٢٧٩.

کەریم حیسامی، کاروانێک لە شەهیدەکانی کوردستانی ئێران، ب.، ١٩٧١، ل ٢٣ ـ ٢٥.

R. Gazi, Kurdistan demoerat Partiaci Iran, Kurdistanide Kur Khulginin Milli Azadiiy Hurakatinin Rahubri, Va Tashkillatical 1943-1946, Baku, 1954, p. 147.

Bolsheya Sovelskaya Encyclopedia, 2.e. Izd, vol. xx vlll, p. 460.

٤٩ ـ كمال مظهر احمد، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٥٨ ـ ٢٥٩.

٥٠ ـ کوردستان لـ (ڕۆژنامە) ژمارە (٢) ١٣ی کانونی دووەمی ١٩٤٦.

## ملخص البحث

# صفحات من نضال الشعب الكردي في ايران

د. فوزية صابر محمد
الجامعة المستنصرية

قضى الغزو البريطاني ـ السوفيتي المشترك على دكتاتورية رضا شاه، وتولى العرش من بعده ابنه محمد رضا بهلوي. ومع ان عهد الشاه الجديد تميز الى حد ما عن عهد والده في امور عديدة الا ان ذلك كان ناجما الى حد كبير عن تأثير العامل الخارجي. ولذا اتسم التغيير بطابع فوقي مجرد لم يكن من شأنه التأثير على اسلوب الحكم القائم سوى في خطوط غير اساسية.

ومع ان احداث الحرب العالمية الثانية ونتائجها تركت اثارها على الجميع في ايران الا ان هذه الاثار خصوصا الصعوبات الاقتصادية وتعسف السلطة وتسيب موظفيها وبحكم عوامل موضوعية محددة اتخذت طابعا متميزا في الاقاليم غير الفارسية ولاسيما في كردستان. والاهم من ذلك كله ان تغييرا يذكر لم يطرأ على سياسة التعصب القومي التي انتهجها الشاه الجديد تجاه الكرد طيلة سنوات الحرب العالمية الثانية.

ومن الطبيعي ان تولد هذه السياسة القصيرة النظر حقدا مشروعا في نفوس الكرد وتدفعهم للتحرك. وهكذا بدأت كردستان تعيش مخاضا ثوريا مهما في سنوات الحرب، وبدأ تحرك الكرد في ايران يدخل مرحلة جديدة، وفي اطار متجدد وتطور مستمر، رغم ان هذا التحرك لم يتخط في الواقع حدود ارهاصات ثورية كرد فعل مشروع على ممارسات النظام البهلوي الذي استهدف وجودهم القومي، وافتقدت الوعاء الايديولوجي والتنظيمي اللازمين لوضعها في اطارها الصحيح ضمن حركة المجتمع. كما ان هذا التحرك ظل في سنوات الحرب دون المستوى المطلوب، فان المداخلات الدولية، والظروف التي رافقتها فرضت نفسها كعنصر حاسم في الموضوع.

ومع ذلك فان نضال الكرد لم يذهب سدى، فما ان وضعت الحرب اوزارها حتى عادوا للتحرك من جديد في اطارا أعمق واشمل لينصب نضالهم، الى جانب شعوب ايران الاخرى، في مجرى نوعي جديد تجلت اثاره في الاحداث العاصفة التي شهدتها كردستان بعد انتهاء الحرب مباشرة.

# گەشەکردنی هەویشەیی پیشەسازی لە نێوان هاوردن و پەرەپێدانی تەکنەلۆژی دا..

د. هوشیار معروف
بەشی ئابووری - کۆلێژی کارگێری و ئابووری/
زانکۆی موستەنصریە.
وەرگێڕانی رۆشنبیری نوێ

بەشی دووەم:

خوێنەرانی ئازیز ئەمە بەشی دووەمی لێکۆڵینەوەکەی د. هوشیار مارفە بە ناوی گەشەکردنی هەمیشەیی پیشەسازی لە نێوان لەباتی دانانی ـ هاوردن و پەرەپێدانی تەکنەلوژی دا کەوا بەشی یەکەمان لە لەژمارە ١٤١ ئەم گۆڤارە بڵاوکردەوەو لەبەر چەند هۆییەکی هونەری بەشی دووەمی دواخرا وا لەم ژمارە یەدا دەیخەینە بەرچاو خوێنەرانی ئازیز.
لەگەڵ سڵاوو ڕێزمان.

٩. پشت ئەستوورکردنی هەنارده وادەخوازێت لەماوەی گوێزانەوەی تەکنولوجیاییدا خەرجی و تێچوونی سەربار بخرێنە سەر نرخی شتومەکی هەنارده کە پێوەندی هەیە بە بروانامەی داهێنان و کاروباری داواکردن و مەکینەدانان و بەرنامەی ڕاهێنان و ڕاوێژکاریی کارگێری و پێداویستی یەکانی پارێزگاری و بەرەوپێش بردنی بەرهەم و تەحویلی پارەداران و کارمەندانی بیگانە.. لێرەدا بەرهەمی نیشتمانی دەکەوێتە سەر دووڕیانێکی لەق:ـ
(أ) یان دەبێ تێچوون و خەرجی پێویست دەخاتە سەر، نرخ ئەوسا توانای بەربەرەکانێی لەبازارەکانی دەرەوەدا کز دەبێت بەتایبەتی کاتێک کە بەرهەمە دیاری کراوەکان لە ئەڵقە یەکەمەکانی تەحویلی دوور

دەکەونەوەو نەرمونیانێکی عادەتیان دەبێت. بۆیە داخوازیی ئەم بەرهەمانە کەم دەکات.
(ب) یان هەموو بەڵێن و ئۆباڵێکی دارایی دەگرێتە ئەستۆ ئەوسا قازانجی کەم دەبێت یان هەرنابێت ئەمەش زۆرتر بواری بەرهەم هێنان فراوان بکرێت تا تێچوونی یەکەی بەرهەم کەم بکاتەوە. بەڵام ئەم فراوان کردنەش وا پێویست دەکات لەلایەکەوە یەکەی تازەی سەرمایەو کاری بۆ سەربار بکرێت لەلایەکی تریشەوە لێهاتوویی و کارزانی بۆ بیزوێت، هەرچی زیادرکردنی مەودای بەرهەم هێنانیشە ئەوا کردارەکە زۆرتر ئەرکی کەرتی گشتی دەبێت چونکە دەزگای حکوومەت لەبەر هەندێ تێبینی بەرژەوەندی ئابووریی گشتی خەرجیی ئەم زیادەو سەربارکردنە دەخاتە ئەستۆی خۆی، لەسەر بناغەی پێش بینی ئەوە کە قازانجی دوارۆژ زیانەکانی ئێستا پڕ دەکاتەوە.

بەڵام دەربارەی هاندانی لێهاتوویی و کارامەیی ئەوا کەمیی هۆکاریی قازانج لەوانەیە ماوە نەدات ئەم ئامانجە بێتەدی لەئاستی کەرتی تایبەتی و بەشێوەیەکی تەسك چونکە دەزانین کە کاریی کردن لەم کەرتەدا بەندە بەوە ئەنجامی ڕادەیی (الناتج الحدى)ی کار لەتێکڕای کریێ زیاتر بێت... لەدواییدا بزواندنی ئەم ئەنجامە پێویست بەکرێ پێ دان و تێچوون بەرزکردنەوە دەکات.. بۆیە کرداری هاندانەکە دیسان دەکەوێتەوە سەرشانی کەرتی گشتی.

١٠. کاری پتەوکردنی هەناردە دەبێتە هۆی گواستنەوەی بەرهەمی نیشتمانی لەباری پاراستنی بازاری ناوخۆیی یەوە بەرەو باری پەیرەوی کردنی لایەنگیری کردنی بازارەکانی دەرەوە.. جا ئەگەر هاتوو ئەرك و باجی ئەو بازارانە هاوشانی ئەرکی ناوەوە بن و هاونیشتمانی بتوانێ ئەنجامەکانی بگرێتە ئەستۆ.. ئەوا هاندەری لایەنگیری کردنی باری هەناردەنی دەرەوە ئاراستەی کەسان و دامەزراوەکانی دەرەوە دەکرێت، بەم جۆرەش ئەرکی بەربەرەکانێ زیاتر دەبێت و ئاڵوگۆڕکردنی نێودەوڵەتی لاوازتر دەبێت[20].

١١. گوشاری ئەو تەنگوچەڵەمانەی لە ئابووری یە بازاڕی یە پێشکەوتووەکاندا ڕەنگ دەداتەوە، لەماوەی کەسادو بێ بازاڕی دا وادەکات داخوازی بەرهەمی وڵاتانی پەرەستێن ئێجگار کەم بێت بەڵام گەلێ لە داخوازیی بەرهەمی وڵاتانی پێشکەوتوو کەمتر.. لەئەنجامدا ئەو پیشەسازییانەی بۆ پشتگیری هەناردە فراوان دەکرێن لەوانەیە تووشی هیوا ڕووخانێکی گەورە ببن کە ئاسەوارەکەی تا ماوەیەکی درێژ هەردەمێنێ بەتایبەتی کاتێ ئەو تەنگوچەڵەمانە دووبارە دەبنەوەو گوشاری خەرج و باج یان مەرجی پارێزگاریی تازە زیاد دەکەن، ئەوسا خاڵی بۆ دواوە هەڵگەڕانەوە دەردەکەوێت.

بەم جۆرە ئەگەر ئەو فراوان کاری یەی هەندێ وڵاتانی پەرەستێن، بەتایبەتی وڵاتە نەوتینەکان بەدیان هێناوە نەیتوانی پەرەپێدان بە ڕاوەی زیاتر یان ئارام گرتوو درێژە پێ بدات[21] ئەوا ستراتیژی بەهێزکردنی هەناردە پەرەپێدانی هەمیشەیی بەدی ناهێنێ!.

## دەرئەنجام و ڕاسپاردەکان

هەڵتەك و داتەکە توندو تیژانەی ـ لەو لایەنانەوە کە ڕووەو نزمی دەڕۆن ـ، کەلەم ساڵانە دوایی دا ڕادەی گەشەکردنی ئابووریی هەرێمە پەرەستێنەکانەوە، بە خۆیانەوە دی، ئەو کەم و کوڕی یە هەمیشەی یەی ترازووی دراوو داشکاندنی سەرمایەو داخستنیان بەرووی ئابووری نێودەوڵەتی دا بە جۆرێك کە نەتوانێ ڕێگای شوێن و ئاکارێکی بەربەرەکانێی ی هاوسەنگ بێتەمەیدانەوە، هەروەها خستنەپشت گوێی گیروگرفتی ژینگەو کاری وێرانکاری پیشەسازی نوێ.

ئەمانە هەموویان وایان لە کۆمەڵگای نێودەوڵەتی کرد کە بیر لەڕەوتێکی ستراتیژی وا بکەنەوە کە بەهۆیەوە بتوانرێ کاروباری گەشەکردنی پیشەسازی و پاراستنی ژینگە بەیەك پێ زامن بکەن هەروەها پاڵ بەو دەوڵەتانەوە دەنێن کە لەڕێگای کۆنگرەی ئیقلیمی و نێودەوڵەتی یەوە چوارچێوەیەکی ستراتیژی داین بکەن هەروەها هانی وڵاتە پیشەسازی یەکان بدات کەگشت وڵاتانی جیهان بە وڵاتە پەرەستێنەکانەوە ڕاپێچی ئەو بیرە جددی یە بەسوودەبکەن کە تەنها بیرلە دوو کاری بنەڕەتی بکەنەوە کەسووی ڕاستەوخۆ بە بەرژەوەندی ئابووری یان دەگەیێنێ ئەوانیش:ـ

(١) بەجیهان کردنی چالاکی یەکانی پیشەسازی یە نیشتمانی یەکان، لەبواری بازاری کراوە بەربەرەکانیی.

(٢) بەجیهان کردنی کێشەی پاراستنی ژینگە.

بەهۆ هەڵسەنگاندی گرنگترین جۆری ستراتیژی پەرەپێدانی پیشەسازی و گەشەپێکردن و کارکردنیان لەوڵاتە پەرەستێنەکاندا بەڕای ئێمە گیروگرفتەکە تەنها لەناوەرۆکی جۆری ستراتیژی یان پەرەپێدانی تەکنۆلۆژی یدا خۆی حەشاردەدات، بەڵکو لەوەدایە کە ئەو دەوڵەتانە بەچەوتی لەو جۆرە پەرەپێدان و پێشکەوتنانە تێ دەگەن، ئەوەتا، ئەم دەوڵەتانە هەمیشە هەوڵی ئەوەیان داوە کە بە تەنها کاربکەن و لەپاشان ڕیبازی بەربەرەکانێ بگرنەبەر ئەویش بەگوێرەی ئەو هەولانەی لەبازارە نێودەوڵەتی یەکاندا بۆی سازدەبێ. ئەوەتا چ جۆرە شێوازێکی ستراتیژی، جۆرەکانی پەرەپێدان پەیرەو دەکات و تەنانەت چ ڕۆژێك هەوڵی ئەوەڵی ئەوە نەدراوە کە نەخشەیەکی پەرەپێدانی قۆناغی بخرێتەکار.. هەروك هەوڵی ئەوەش نەدراوە کەڕادەی توانیستی مرۆڤانە بەشێوەیەکی جددی بەرزبکەنەوە.. بەمەرجێك لەئەنجامدا دەگەڵ پێداویستی تەکنۆلۆژیای هاوچەرخدا بگونجێ.

دەوڵەتە پەرەستێنەکان، تائێستا ـ لەسنووری کەرتی گشتی و کەرتی تایبەت دا ـ عەودالی سێ هاندەری سەرەکی بوون..:(لاسایی کردنەوەو موحاکات و ڕواڵەتی ئاشکراو ڕووکەش..)

وەلەئەنجامدا پەرەپێدانی بەردەوام نابێت و هەروەها ڕادەی گەشەکردن هەمیشە ڕووبەڕووی چەند بارێکی نزم دەبێتەوەو قەرزی کۆنی کەڵەکەبووهەمیشە داهاتی نەتەوایەتی و یەدەکی ئیستماری کەل دەکات و دەیخاتە بارێکی شلۆقەوە..

وەبۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەم ڕاستیانە پێویستە لەسەر وڵاتە پەرەستینەکان و لەوانەش عیراق، کە جۆری ستراتیژی و پڕاوپڕی تەواو بگرنە ئەستۆ، لەچوارچێوەی هەرەوەزی ئیقلیمی و نەخشە بۆکێشراودا کاربکەن.. وەبەرەبەرە کۆتی پاراستنی پیشەسازی لابەرن، تاپیشەسازی یەکانیان متمانە بەخۆیان بکن و بەرەو بەرەبەرەکانێ ڕاستەوخۆ هەنگاو بنین.

هەروەها قۆناغی یەکەم ئەو ئەرکە دەخانە سەرشانی گشت هەرێمەکان کە دەست لە زیادکردنی باری ئیستماری هەڵگرن، تا بەتەواوەتی بتوانن واقیعی پەیکەری پیشەسازی بەهەموو وردەکاری یەکی چالاکی و شوێن ودامەزراوو جۆری تەکنۆلۆژی و یەدەکی دارایی و پەیوەندی تەکنیکی پەوە دەست نیشان بکەن.

لەپاش ئەوەی هەموو ڕاست کردنەوەیەکی پێویست، بەمەبەستی تکاملی پیشەسازی و دەست نیشان کردنی ئەڵقە وونەکانی بەرهەم هێنان و دیاری کردنی سنووری توانای بەربەرەکانێی سازدەکرێن.. ئەو لەوکاتەدا دەتوانین چالاکی وەبەرهێنان لەرێگای بەرنامەیەکی هاندەرانەی ناسکەوە بەردەوام بێتەوە کە بتوانێ وەبەرهێنان بەرەو بەتواناترین چالاکی و شوێن و دامەزراو ئاراستەبکات..

لەم بوارەدا وابە پێویست دەزانین کە لە تاقی کردنەوەی ژاپۆن، لەبواری کاروباری تەعویزکردنی هاوردە بە باری پتەوکردنی هەناردە بکۆڵینەوە.

لێرەشدا نموونەیەکی تایبەتی هەیە کە شایانی بایەخ پێدانە ئەم نموونەیەش دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٣٧ کاتێک کە K. AKAMATUS، لەدانشگای Hitosubashi وە جۆرە لێکۆڵینەوەیەکی بەناوی «مراوی یە باڵدارە دەشتەکی یەکان ـ Gees Flying Pattern[٢٢]» ئامادەکرد کە باری ئابووری لەباری پەیرەوکردنی ئەو پیشەسازی یانەی کەلەبری هاوردەی شمەکی ئیستهلاکی پەوە بەرەو ئەو پیشەسازی یانە بگۆڕێ کە تەعویزی هاوردەی شمەکی سەرمایەداری دەکەن لەپاشان بەرەو ئەو پیشەسازیانەی کە هەناردەی ئیستهلاکی پتەودەکەن و لەدووایش دا بەرەو ئەو پیشەسازی یانەی کە هەناردەی سەرمایەداری پتەو دەکەن..

## پەراوێزەکان:ـ

١. هوشیار معروف: (التحول البنیانی وتطور العلاقات القطاعیة فی العراق) مؤتمر کلیة الادارة والاقتصاد/ الجامعة المستنصریة بغداد ١٩٩٢ جدول رقم (٣).

٢. A. M.Bfoak; Sustained Development, Trends andpolicies Hitters. Cambridge, 1993 PP5-9.

٣. UNIDO, Industrial Development, Global Reports, 1996, Oup, London,1996

٤. هوشیار معروف: تغییرات الناتج التحویلي والمجاهات الانتاجیة والتشغیل مؤتمر کلیة الادارة والاقتصاد/ الجامعة المستنصریة، بغداد ١٩٩٠.

٥. H. Hooker; Privatization and Restless Nations, Retledge,London, 1994.

٦. البنك الدولی: نحو عمل مشترك للحفاظ علی البیئة واستراتیجیة البیئة لتحقیق التنمیة القابلة للاستمرار فی منطقة الشرق الاوسط وشمال افریقیا، واشنطن ١٩٩٤ ص١١.

٧. فلاح سعید جبر: الصناعات الغذائیة والامن الغذائي، النفط والتنمیة العدد الثانی، اذار، نیسان ١٩٨٩.

٨. لمزید من التفاصیل، راجع: Un, Import - Substitution and Export Promotion inE.C. A. F. G. Countries,Bangkok, 1964.

G. Cukor, (Industrialk Development Strategy in Developing Countries) in T. Fold; Economic Development, AKademiai Kiado, Budapest, 1978 PP44-56.

M. Shinohara, (Economic Development and Foreign Trade in Pre-war Japan) in T. Szentes; The Political Economy of Underdevelopment, Akademiai Kiado, Budapest, 1983 PP242-244.

الامم المتحدة، تقریر التجارة الدولیة، نیویورك ١٩٨٩.

G. van lint, Industry on the Move, ILO, Geneva, 1992.

un, Industry in the 1980s, Structural Change and Interdependence, New - York 1983 PP 33, 57' 6

un, Economic and Social Council, The Manufacturing Sector in the Escwa Region in the 1980s. Industrial Development Series, No. 5, 25 Dec. 1987.

(٩) تجاوزت دیون الاقطار النامیة فی نهایة ١٩٩٦ اکثر من ترلیونین من الدولارات والتی بلغت حوالی ٤٠٪ من GDP وهذا یمثل اکبر استنزاف فی الدخل القومی وامکانات التنمیة IEC, World Statistics ataglamce, sep. 1996 وفی دراسة خلال ١٩٧٩ -

١٩٨٣ تبين ان الديون الخارجية ساهمت في هبوط معدلات النمو الاقتصاديه للاقطار النامية الى ٢٪.

A. Singh (Industrial Policy in Developing Countries) in unido; Industry and Development, No. 23, 1988 P2.

(١٠) UNIDO, Industrial Development, Global Report 1996 P11.

(١١) Ibid pp 19-39.

(١٢) Ibid p61.

(١٣) R. Kitchen andy. Weiss (Prices and Government Interventionsin Development, No. 20. 1988.

(١٤) علي مجيد الحمادي (دراسة تحليلية لمصادر النمو في القطر العراقي)، الصناعة، العدد الاول ١٩٨٩.

(١٥) لمزيد من التفاصيل، راجع: P. David, Technical Change,Innovation and Economic Growth,Cambride University Press, Cambidge, 1975.

H.G. Johnson; Technology and Economic Intersepenadence, Macmillan,London, 1975.

M. Simai (Interdependence and Conflicts) in Sijthoff and Noordhoff; The World Economy Akademiai Kiado, Budapest, 1980.

S.Deger and S.Sen; (Technology and Arms Production in Developing Countries) in UNIDO Industry and Development, No. 14, New York, 1985 اسكوا، انماط نقل التكنولوجيا في منطقة اسكوا، وطرق تحسين كفاءتها، بغداد ١٩٨٧.

Secretariat of Unido (Industrial Policies and Strategies in Developing Countries) in Unidi, Industry and Development. No. 18, 1985.

(١٦) راجع: Un; Economic and Social Council; op cit UNIDO, Industrial Development, Global Report, 1996 PP45-52

Un, Industry in the 1980s P164.

M. Shinohara; Op. cit P242.

(١٧) ثُشمنغ شثي زُ ÷عفنشاخقسف؛ )يُحخفف ثُخهنسهةل نخةثس؛ فاث case of the Korea) in UNIDO, Industry and Development. No. 26, Vienna, 1989 P3.

(١٨) A.O. Hirschman; The Strategy Of Economic Development, Yale University Press, New Haven, 1959 P125.

(١٩) Un; Economic and Social Council; op. cit P.

Zarembka; Accumulation of capital in the Perophery, ILO, Geneva. 1983. P20

(٢٠) Un; Esc AP, Economic Buuetin for Asia and the Pacific,Vol xxv111 No. 1/2 Jan./ Dec. 1977,New York, 1977 P40

G. Cukor; Op. cit P56.

(٢١) D. Salvatore and E. T. Dowling, Theory and Problems of Development Economics, Mc Graw - Hill, N.Y. 1997.

(٢٢) M. Shinohara; Op. cit. P233.

## الخلاصة

# التنمية الصناعية المستديمة بين تعويض الاستيراد والتطور التكنولوجي

د. هوشيار معروف
الجامعة المستنصرية/كلية الادارة والاقتصاد

يتناول الموسوم التنمية الصناعية المستديمة بين تعويض الاستيراد والتطور التكنولوجي هذه الموضوعية المستديمة بين تعويض الاستيراد والتطور التكنولوجي هذه الموضوعة من خلال خمسة محاور رئيسة وهي على التوالي (١)مفهوم التنمية المستديمة ومقوماتها الاساسية (٥) استراتيجية تعويض الاستيرادات وعملية التنمية المستديمة (٣) التطور التكنولوجي والتنمية المستديمة (٤) استراتيجية تعويض الاستيرادات والتطور التكنولوجي (٥) التحول نحو استراتيجي تعزيز الصادرات والتنمية المستديمة..

ومن خلال هذه المحاور يتناول التقلبات الشديدة بالاتجاه الهابط التي شهدتها معدلات النمو الاقتصادي للاقطار النامية في السنوات الاخيرة وما رافق ذلك من عجز في موازين المدفوعات وتدهور في رؤوس الاموال وعدم الانفتاح على الاقتصاد العالمي من خلال موقع تنافسي متكافيء واهمال مشكلات تلوث البيئة والتخريب للصناعات الحديثة مما دفع بالمجتمع الدولي الى البحث عن صيغة استراتيجية للتوافق بين التنمية الصناعية وحماية البيئة.

ومن خلال ذلك يرى الباحث بان المشكلة لا تكمن في ذات الانماط الاستراتيجية والتطورات التكنولوجية، انها تقع في سوء استيعاب الدول النامية لهذه الانماط والتطورات ومن خلال كل ذلك يخرج الباحث باستنتاجاته حول هذه القضية.

بەبۆنەی یادی سەد ساڵەی ڕۆژنامەگەری کوردی یەوە

# چەند تێبینی یەك دەربارەی باری ئەمڕۆی ڕۆژنامەگەریی کوردی

ئەحمەد زەردەشت

لەچوار چێوەی چالاکییەکانی دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی و بە بۆنەی یادی سەد ساڵەی رۆژنامەنووسی کوردییەوە لە ٩٨/٤/٢٨ کۆڕێکی ڕۆشنبیری لە لایەن دەزگاکەمانەوە بۆ مامۆستا ئەحمەد زەردەشت بە ناونیشانی چەند تێبینی یەك دەربارەی باری ئەمڕۆی رۆژنامەگەریی کوردییەوە سازکرد.. رۆشنبیری نوێ بە شانازییەوە بۆ خوێنەرانی ئازیزی بڵاوی دەکاتەوە..



**پێشەکی:-**

مەبەست لەم باسە تانەو توانج گرتن و کەم کردنەوەی دەورو بایەخی کەسێك یاخود چەند لایەنێك ن یە، بەڵکو دەمانەوێ هەوڵێکی ڕاستەقینەی ڕاست و دڵسۆزانە بدەین و باری سەرنج و ڕووناکی بخەینە سەر هەندێ لایەنی واقیعی ئەمڕۆ کە دڵنیاین هەندێ یان زوربەتان لەدوورو نزیکەوە ئاگادارین و یا هیچ نەبێ هەندێکی لێ دەزانن.

ئەوەش رادەگەێنین کە ئاماژە بۆ چ ناو، یاکەسانێك ناکەین، ئەم لێکۆڵینەوەیە تەنها هەندێ ڕواڵەت باو دەخاتە ڕوو کە بەگوێرەی تواناو بۆچوون هەوڵ دەدەین پێشنیاری هەندێ چارەسەریان بۆبکەین. هەربۆیە ئەم کارە دەخەینە تەك کارێکی ڕەخنەیی دڵسۆزانەی ئیجابی یەوە...

ئاشکرایە رۆژانە چەند رۆژنامەو بڵاوکراوە لەم جیهانە فراوانەدا لەچاپ دەدرێن و بڵاودەکرێنەوە، هەربۆیە مەرج ن یە هەموو ئەوانەی کە دەنووسرێن ڕاست و دروست و ڕەواو سەرکەوتووبن.

ئامادە بوونتان ئا لەم هۆڵەداو لێ دوانمان لەم شوێنەوە کە خودی خۆم بەشوێنێکی سەربەستی دەزانیم، دیارە لەبەر ئەوە ن یە کە سەرلەنوێ باسی مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردی تان بۆ بکەین و شانازی بە باوو باپیرانەوە بکەین و هەندێ سەر ناوو دروشم و ناوی کەسانی بەرین، نەخێر، ئەوەمان مەبەست ن یەو، لەگەڵ رێزو شانازی ماندا. بەتایبەتی هەندێ لە ئامادەبووان لەئێمە زیاتر زانیاری و شارەزایی یان لەو بوارەدا هەیە..

واتا، ئێمە تەنها باسی باری واقیعی ئەمڕۆی رۆژنامەگەریی کوردی دەکەین.

**پێشەدستی**

لەم لێکۆڵینەوەیەدا، لەدوو تەوەرەی سەرەکی یەوە دەچینە ناو جەرگەی باسەکەوە کەئەوانیش:-

یەکەم:- بارو واقیعی ئێستای رۆژنامەگەری لە ناوچەی کوردستاندا.

**دووهەم:-** بارو واقیعی ئێستای ڕۆژنامەگەری لەدەرەوەی ناوچەی حوکمی زاتی دا.

لەخاڵی یەکەمدا، کەدێینە سەر باسی ئێستای رۆژنامەگەری لەناوچەی کوردستاندا، بەگوێرەی زانیاری و ئاگاداریمان لەم بوارەدا، چەندین لایەن لە پشت دەرچوونی ئەو رۆژنامەو گۆڤارانەوەن، کە رۆژانە دەردەچن و، شتێکی ئاشکراو ئاسایی یە، کە ژمارەیەك نووسەرو ڕۆشنبیرو ئەدیبی بەتواناو لێهاتووی کوردمان - «دوور لەوەی کە چی دەنووسن و بەرگری لەکێ دەکەن و دژ بە کێ ووشەکانیان دەخەنە کار....» - چونکە ئەم لایەنە لەچوارچێوەی بایەخ پێدانی ئێمەدا ن یە.. ، بەشداری تیایاندانە دەکەن و ژیانیان پێ دەبەخشن ژمارەیەکی زۆر [illegible]رو ئەدیبانی کوردمان کە گاڵتەیان پێ ناکرێ و شوێن پەنجەیان هەمیشە دیارە، بەشداری لە دەوڵەمەند کردن و پەرەپێدان و دەرچوونی ئەو رۆژنامەو بڵاوکراوانەدا دەکەن و بمانەوێ و نەمانەوێ بەشێکی (چەندو چەشن)ن لەمێژووی ڕۆژنامەگەری کوردی ماندا، لەئەنجامدا، ڕۆژنامەگەری یەکی بەربەرەکانی کەری بڵاوکراوەکانمان لەناوچەی کوردستاندا لەئارادایە، کە شان بەشان دەوەستنەوە.

بەرای ئێمە هۆی بەردەوامبوون و سەرکەوتنی رۆژنامەگەری لەناوچەی کوردستاندا دەگەرێتەوە بۆ چەند کارگێڕ و هۆیەکی سەرەکی کە لە هەمووان گرنگتر... ئەمانەن:-

١ ـ دەوری ئەو نووسەرانەی کە ئێستا لەناوچەی کوردستاندا چالاکی دەنوێنن ـ لەبارەی ژمارەو تواناوە ـ

٢ ـ بوونێتی کادیری پیشەیی و هونەریی و تەکنیکاری شارەزا ی کورد لەناوچەکەدا.

٣ ـ پشت بەستن بە ئامێرو چاپخانەی نوێ و ئامێری کۆمپیوتەر،

٤ ـ یاریدەدانی بێ ووچان ماددی و دارایی، لەلایەنە بڵاوکەرەوەکانی ئێستای لەمەر گۆڕەپانی کوردستان و هاندانی نووسەران.

٥ ـ بوونێتی خوێنەر لە هەمان گۆڕەپانی دەرچوون و بەرهەم هێنان و گەیشتنی زوو بەزوویی ڕۆژنامەو گۆڤارەکان بەخوێنەر..

٦ ـ دەوری ئامێرو دەزگاکانی تری ڕاگەیاندن، لەیاریدەدان و بڵاوکردنەوەو دەوڵەمەند کردنی خوێنەر، بەتایبەتی ئەوانەی هی ڕۆژئاوا کە بەرنامەکانیان لەناوچەکەدا لە ڕێگای تەلەفزیۆن و ئامێری سەتەلایتەوە پەخش دەکەن، تەنانەت ئەو ئامێرانە ئێستا لەچاپخانەو یانە گشتی یەکانیشدا بەدی دەکرێن.

٧ ـ سەرەڕای هەموو ئەمانەی کەباسمان لێوەکردن، لایەنی لایەنگیری کردنی خوێنەر بۆ ئەو بڵاوکراوانە چونکە هەریەکەو بەگوێرەی ڕاو بۆچوونی خۆی لایەنێك پەیرەودەکات و هەست و نەستی لەگەڵ ئەو بڵاوکراوانەدایە کە نوێنەرایەتی ڕوانگەی بۆچوون و سیاسی و لایەنی ڕێکخراویی خۆیان دەکات..

لێرەوە دەتوانین بڵێین ئەو ڕۆژنامەو گۆڤارانەی ئەمڕۆ لە ناوچەی کوردستاندا دەردەچن، بێ گومان پێشکەوتووو باشن و لەلایەنی بابەت و زمانەوانی و دەرهێنانی هونەری یەوە سەرکەوتوون و لەوەدەکات کە هەڵەی چاپی یان تیادا نەبێ، بەرامبەر بەمەش و بۆ ئەوەی بتوانین جێگایەکی راستەقینەو دروست و ڕەوا لەنێو جەماوەری خوێنەرانی کوردستاندا داین بکەین، دەبێت ئەو خاڵانەی سەرەوە بخەینە پێش چاومان..

سەبارەت بە ڕۆژنامەگەری لە دەرەوەی ناوچەی کوردستان (حوکمی زاتی)دا، وەك هەمووان دەزانین و ئاشکرایە ئەو ڕۆژنامەو گۆڤارانەن کە بەتایبەتی لەبەغداوە دەردەچن، ژمارەیەك نوسەرو ڕۆشنبیری کورد بەشداری یان تیادا دەکەن، دەبێ ئەوەش بخەینە پێش چاو کە هەندێ نووسەر، بەهۆی هەندێ هۆی خۆیی و مەوزووعی یەوە دوورە پەرێزن، هەربۆیە سەرەتای گیروگرفت و کۆسپی ڕۆژنامەگەریمان لەوئاستەوە دەست پێ دەکات کە بەگوێرەی تاقی کردنەوەو کارکردنی ڕاستەوخۆو کە لەنزیکەوە ئاگامان لەو بڵاوکراوانە هەیە، بەش بەحاڵی خۆمان لەم بابەتە دەدەوێین:ـ

● ئەو پرسیارانەی کە لێرەدا دەکرێن...

جۆروباری ئەو ڕۆژنامەو گۆڤارانە چین کە لەدەرەوەی ناوچەی ئۆتۆنۆمی دا دەردەچن.؟ بەشێوەیەکی گشتی ئەو بڵاوکراوانە سیاسی گشتی و ئەدەبی جۆراوجۆرن زۆربەیان لەژێر باری گەماڕۆی ناهەمواردا لەلایەن دەزگاکانی دەوڵەتەوە دەرلەچن.

بێ گومان، کەم تەرخەمی و دەست کورتی یەکی ئاشکرا لە قەبلاندنی لایەنی دارایی ئەو بڵاوکراوانەدابەدی دەکرێت...

● کێ دەنووسێ؟. بۆ کێ و لە ژێر چ بارووددۆخێکدا؟.

لەوانەیە هەندێك ئەم پرسیارەمان بەسادەو دوورەمەکی لەقەڵەم بدات، بەڵام ئەوەی گومانی لەسەر نی یە، بەشێك لە کەڵە نووسەرو ئەدیبانمان هەڵوێستێکی بێ لایەنیان هەیە بەرامبەر بەوەی ئێستا بەسەر گۆڕەپانی سیاسی عیراقەوەیەوبەتایبەتی ئەوەی لە کوردستاندا باوە، ئەوەتا هەندێکیان وەك تەماشاکەرێکی چاوەڕوانکەر بەرامبەر بە ڕووداوەکان دەوەستێت، بەبێ ئەوەی فرزە بکات و هەندێکیشیان بە جۆرە خۆپاراستن و دیپلۆماسی یەوە (باپێی بڵێین بێ ئارامی)یەوە دەنووسن و هەر بۆیە بواری هەندێ بێگانەی مەیانی ئەدەب و ڕۆشنبیری و نووسینی درا کە خۆیان بهاوێژنە گۆڕەپانی نووسینەوەو تواناو وزەو ڕەنجی ئەم و ئەو زەوت کەن (لەکوردو عەرەب) بە ماستاو خەست کردنەوەیەکی ئاشکراوە بابەتەکانیان برازێننەوە بەرامبەر بەم بارەش هەندێکی تر هەڵوێستێکی ڕاست و چاونەترسانەی دوور لەمەرایی و ڕیایی کردنیان گرتۆتەخۆو بەگیانێکی ڕاستی نەتەوایەتی یەوەو دوورلە چ ئیعتیبارێکی تر دەنووسن.. کەچی لەلایەکی ترەوە بەشێکی تر، دەنووسن یان بۆیان دەنووسرێ، تەنها لەبەر ئەوەی ناویان لەڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا دەرچێ، یان بەمەبەستی دەستکەوتێکی ماددی و دارایی یەوەیە...

بەرامبەر بەنووسەریش، ئەوەتا خوێنەری کورد خاوەن جۆش و خرۆش و هەست و نەستێکی پاکەو زوو هەست بە شت دەکات و خاوەن خەیاڵ و ئەندێشەیەکی فراوانەو هەمیشە حەز لەرەخنەی بەتەوسەوە دەکات، نەتەوەی کوردی خۆش دەوێت و هەمیشە شانازی پێوەدەکات و تەنانەت لەهەندێ جاردا ئەو شانازی یەی دەگاتە پلەی ڕەگەزپەرستی و دەمارگیری..

سەرەکی فەرماندە صدام حسین خواپیارێزی دەفەرموێ:ـ «باس کردنی لایەنی کوردایەتی لاوازمان ناکات، ئەگەر لەچوارچێوەی باسکردنی ئەوەدابێت کە هەموو عیراقین و شانازی بەوەوە دەکەین...» بەرێزی دەفەرموێ:ـ «گرنگترین هیماکانی چاونەترسی و نەبەزی ئەوەیە کە ڕاستی بڵێین و لەگەڵ ڕاستی دا یەك بگرینەوە...»، هەرجەنایشێتی کەوا دادەنێ کورد مافێکی سەرباریان هەیە، بەو کوێرەیەی کە کوردو عیراقیشن... دەبا ئەم ووتەو کردارانەی بەمافێکی نەتەوایەتی خۆمان بزانین و، ئەم مافە لەخودی خۆمان زەوت نەکەین و باسی ئەو بابەتانە بکەین کە خوێنەرانی کوردستان مەبەستیانە

بۆ ئەوەی لەئاست بەرپرسیارێتی خۆماندا بین و بتوانین خوێنەری کورد بەلای خۆماندا ڕاکێشین، دەبێ بەشوێن لایەنەکانی سەرکەوتندا بگەڕێین و ڕۆژنامە نووسی نەکەینە پیشەیەکی ڕۆژانەی ڕۆتینی کە تەنها مەبەستمان پڕکردنەوەی لاپەرەکان بێت و ڕۆژانە ژمارەیەکی تر بەسەر ژمارەکانی تری بڵاوکراوەکانمانەوە کەڵەکە بکەین.

ئالەم ئاستەوە، پێویستە پرسیارێك بکەین.. کە ئەویش لایەنی و

هۆکانی سەرکەوتنی کاری رۆژنامەگەری کوردی، لەدەرەوەی ناوچەی کوردستان دا کامانەن. ! تابتوانین لە گۆرەپانی کوردستاندا جێگایەکی فراوان بۆ خۆمان بکەینەوەو جڵەوی دەست پێشخەری کاری جددی بەدەستەوە بگرین و، بە تواناو هێزێکی تەواوەوە جێگای خۆمان بکەینەوە..!؟..

بەرای ئێمە گرنگترین هۆکانی سەرکەوتن خۆیان لەم خاڵانەدا بەدی دەکەن..:ـ

١ ـ باسکردنی ئەو بابەتانەی کە دەگەڵ خواست و ویست و ئامانجەکانی گەلی کوردماندا لەچوارچێوەی عیراقێکی یەکگرتووی نیشتمانی دا

٢ ـ بوژاندنەوەی لایەنی مێژوویی و کەلەپووریی و ئەدەبی رەسەنی گەلی کوردمان..

٣ ـ خستنە رووی کارو بابەتێ جددی و رەسەنەکانی لایەنی هونەری میللی و فۆلکلۆری گەلی کوردمان

٤ ـ بایەخدان بەلایەنی سایکۆلۆژی کۆمەڵگای کورد بەمەرجێ نووسینەکانمان بتوانن بەدەنگ پێویستی یەکانی ئەوکۆمەڵگایەوەبچن، وتەنانەت لەگەڵ پێشکەوتنی گشتی دا بگونجێن..

٥ ـ دوورکەوتنەوە لەبریندارکردنی بارو زەوقی گشتی رۆڵەکان کوردمان.

٦ ـ راستی یەکان، بەوپەری راستگۆیی یەوە بخرێنە روو؛ وپەیرەوکردنی سیاسەت و رێبازێکی راگەیاندنی راست، کە تەنها مەبەستی سەرکەوتنی کانی نەبێت واتا بەخولقاندنی و هەڵبەستنی هەواڵ و رووداوی ناراست و نابەجێ و بەزۆر لکاندنیان بەورووداوانەی ئەمرۆی ناوچە کوردستانەوە..

٧ ـ خولقاندنی بارێکی راست کەدووربێت لە چاو لەدوویی لایەنی دارایی و بازرگانی یەو...

٨ ـ بلاوکردنەوەی بابەتی خۆشی هەمە جۆر کە باری سەرنجی خوێنەر رابکێشێ.

٩ ـ راگرتنی دیاردەی گۆرینی بابەتی بێ کەڵك، لەعەرەبی یەوو بەزۆر سەپاندنی بەسەر خوێنەری کورددا، بەدڵنیایی شەوە دەڵێم کەس نایانخوێنێتەوە!!..

١٠ ـ خستنە کاری ئەو هەڵ و لایەنە لاوازانەی کە ئێستا لەناوچەی کوردستاندا باون و، بەکارهێنانیان وەك چەکێکی راگەیاندنی بەمەبەستی رۆشنکردنەوەی بەرچاوی خوێنەر کورد...

ئەم لایەنانەو چەندین لایەنی تر، سووچێکن لە بەرەکانی کاری رۆژنامەماندا، کە دەبێ لایەنی مەبدەئیش لەم ناوەدا نەکرێتە قوربانی...

### ● چۆن بە خوێنەری دەگەین؟

گەیاندنی بابەت بە خوێنەر لەپێش هەموو شتێکەوە بەرێگای کلیلی زبانەوەیە، زبانی رەسەن و پتەو پاراو و پەتی کە دوور بێت لەهەموو جۆرە هەڵەیەکەوە...، ئەمەش یەکەم پەردە بەرەو خوێنەر.. لێرەوە هەڵس وکەوت کردن و کارلێك کردنی نێوان نووسەرو بلاوکراوەکەوە دەست پێ دەکات، کە لە لایەنێکی ترەوە لەنێوان هەردووکیانداو نێوان خوێنەردا دەست پێ دەکات..

لەکەلێنی ئەم پەیوەندی یانەوە، کۆسپەکانی رۆژانە قوت دەبنەوەو دەبنە هۆی پەیدابوونی بوارێکی فراوان لەنێوان ئەو بلاوکراوەیەو نێوان خوێنەردا...

### ● ئەو کۆسپانە چین..؟

بەگوێرەی تاقی کردنەوەی خودی خۆم و هەڵس وکەوتی لەنزیکەوەم و لەرێگای پەنابردنە بەر دەست کەلاکانی لێکۆڵینەوە وەك چاودێری و سەیرکردن و دیقەت دان و لەگەڵدا هەڵس و کەوت کردن و بەگوێرەی ئەو شارەزایی یەی کە بەش بەحاڵی خۆم شتێکی دەربارە دەزانم، ئەوکۆسپانە بەسەر سێ تەوەردا دابەش دەکەم، کە ئەمانەن:ـ

### ● تەوەرەی یەکەم:ـ

ئەو کۆسپە تایبەتی یانەی کە پەیوەندی یان بە خودی نووسەر و دەقە کوردی یەکەوە هەیە:ـ

یەکەم هەنگاوی کار لە نووسەرو دەقە نووسراوەکەوە دەست پێ دەکات و بەرای من دەوری نووسەر لەم خاڵانەدا خۆی دەنوێنێ:ـ

١ ـ شێوازو دارشتنی پتەو رەسەن، یا بەپێچەوانەوە کە ئەمەش وا لەخوێنەر دەکات ئەو نووسینە پەسەندکات، یام نا..

٢ ـ هەندێ بابەت بەهۆی درێژی یەوە خوێنەر بێ تاقەت دەکات، هەربۆیە پەسەند ناکرێت.

٣ ـ جۆرو باری ناوەرۆکی ئەو بابەتەی کە باس دەکرێت و گونجاندنی بۆ بلاوکردنەوە، یام نا.

٤ ـ رادەی پەیرەوکردنی رێزمان و دارشتنی راست وپتەو..

٥ ـ باری جیاوازی رێنووسی کوردی، تەنانەت هەندێ نووسەر لەیەك نووسیندا هەمان ووشە بەدوو جۆر رێنووس دەنووسن..

٦ ـ جوانێتی خەت و لایەنی ئاشکرو روونی نووسین و بەجێ هێشتنی مەودای شیاو لەنێوان ووشەو دێرەکاندا، کە ئەمەش کاری لەچاپدان و راستکردنەوەی هەڵەو تەنانەت کاری هەڵسەنگاندنیش ئاسان دەکات.

### ● تەوەرەی دووهەم:ـ

#### کۆسپەکانی کاری رۆژانەی رۆژنامە نووسان

کە ئەمەش هاوبەشێتی گرنگی خۆی دەکات لە کاری پتەوکردنی پەیوەندی یەکانی نێوان رۆژنامەو گۆڤارو خوێنەردا بەرا من خۆی لەچەند خاڵێکدا دەنوێنێ، ئەوا بەکورتی باسی لێوە دەکەین:ـ

یەکەم:ـ نەبوونی دەستەی نووسەرانی تایبەت بەهەر رۆژنامەو گۆڤارێکەوە، یا بوونێتی ئەو دەستەیانە ئەوا تەنها بارێکی گرانی وچ جۆرە دەورێکیان نی یە مەگەر بەدەگمەن!

هەروەك جۆرە دابەشکردنێکی کاری رۆژانە لەئامادەکردنی لاپەرەکانی دا ئاشکرادەبێت تەنانەت لەوێش بەولاوە لەنێوان جۆری نووسینەکاندا رچاودەکرێت ئەمەش لەرۆژنامە عەرەبی و بیانی یەکاندا

لەعیراق و لەدەرەوەی ولاتدا دەبینرێت.

بەلام ڕۆژنامەگەری ئەمڕۆمان، لەوبارەیەوە شێوازێکی پەیکەری دوور لەچالاکی دەستەی نووسەران و تەنانەت سکرتاری بەتی نووسینیش پێ دەسەلاتەو چ کارێکی لەباردا نی یەو چ دەورێکی دیاری کراوی نی یە، لەئەنجامیشدا بریار بەدەست کەسێکە یا دووکەسەوەو بەس و را هەر رای ئەوانە. ئەم ڕواڵەتەش هەندی لایەنی ناپەسەند دەبوژێنێتەوە کە بەبۆچوونی من ئەمانەن:-

١ - زاڵ نەبوون بەسەر کاری ڕۆژانەداو پەیرەونەکردنی شێوازو ڕێبازی زانستی و راست.

٢ - هەوڵدان بەمەبەستی دەرچوونی ڕۆژنامەو گۆڤارەکە، لەکاتی خۆیدا بەبێ ئەوەی ئاورێکی جلدی لەناوەرۆك و شێوەی بدرێتەوە. . .

٣ - وەك ڕاستی یەکی زانستی، ئەوا بەگوێرەی وزەو کارو ماندووبوون، زیاتر دەکەونە داوی هەڵەوە.

٤ - لایەنگیری کردنی نارەواو کارتی کردنی باری میزاجی و کاتیی لە هەڵبژاردن و پەیرەوکردن و بلاوکردنەوەی بابەتەکان بەو جۆرە دەبێتە کارێکی ئاسایی و لەهەموو کاتێکدا دەخرێتە بەرچاوو هەروەك مەرایی و ڕیایی کردن و ناسیاویی دەوری خۆ دەبینێ. .

٥ - دوو دڵی و سەلماندنەوە لەئاست بلاوکردنەوەی هەندێ بابەت دا.

٦ - نەگونجاندنی زۆر بابەت لەگەڵ باری بلاوکردنەوەدا کەچی لەبەر هەندێ هۆ بلاودەکرێنەوە ئەو بابەتانەش بەم جۆرەن

أ - لەلایەنی زمانەوانی و دارشتن وبیناکاری یەوە لاوازن.

ب - لەلایەنی واتاو ناوەرۆکەوە لاوازن.

جـ - هەندێ بابەت بابەتی خوێنلنی و پسپۆری و شارەزایی یەکی وردیان لەو بوارە زانستی یەدا دەوێت لای خوێنەر مەبەست نین و تەنها بۆ بەشێکی تایبەتی زۆر کەم دەنووسرێن کە لەهیچەوە دیارنین. لەگەڵ ڕیزماندا.

د - هەندێ بابەتی گۆڕاو لەسەرچاوەی عەرەبی یەوە یاخود بیانی یەوە کەزۆر درێژن و بەزنجیرە بلاودەکرێنەوە لەکاتێکدا دەقە عەرەبی یەکەی زۆر بەئاسانی دەست خوێنەری کورد دەکەوێ، گەر مەبەستیان بێت دووەهەم:- ئەو کۆسپانەی کە پەیوەند یان بە گۆڕینی نووسین و هەواڵ و جۆری گەیاندنی بە خوێنەری کوردەوە هەیە. .

دووهەم:- ئەو کۆسپانەی کە پەیوەندی یان بە گۆڕینی نووسین و هەواڵ و جۆری گەیاندنی بە خوێنەری کوردەوە هەیە. .

لێرەدا دەبێ پشوویەکی بۆ بدەین و ساتێك لە ڕۆخی ئەم خاڵەدا بوەستین و بلێین تازەیی هەواڵ مەرجێکی ئاشکرایە.

ئەوەی دیارو ئاسایی یە کە پەرتووکێکی زانستی هەندی ڕاستی تیادا بەدی دەکرێت، بەلام مەرج نی یە کەهەموو یاخود تازەترین هەواڵی ئەو ڕاستی یانە بگرێتە خۆی، لەگەڵ ئەوەشدا بەپێزو تام و چێژو سوودی خۆیەوە دەمێنێتەوە. .

بەلام ئەو زانیاری یانەی کە کۆن دەبن ناچنە پاڵ پایەی هەواڵەوە. .

بۆیان نی یە لەبواری ڕۆژنامەگەری دا دەوری هەواڵ ببینن، ئاشکرایە گیروگرفتی بابەتی هەواڵ، بەتایبەتی بەلای ئێمەوە وابەئاسانی لەهەموو ئان و کاتێکدا چارەسەرناکرێت.

لەواقیعی ئەمڕۆماندا هەواڵەکان دەنووسرێن، یاخود ئەوەی راستی بێت لەعەرەبی یەوە دەگۆڕێتە سەر زمانی کوردی، ئەویش پاش ڕۆژێك یا دوو ڕۆژ لەبلاوکردنەوەی ئەوهەواڵە، وەبەگوێرەی هەل ومەرجی باری ئەمڕۆی کوردستان ئەوا چەند ڕۆژێکی تری دەوێت تا ئەو ژمارەیە بەدەست خوێنەر دەگات، لەئەنجامدا ئەم هەواڵ و لێدوان و ڕاپورتانە کۆن دەبن، دەبێ ئەوەشمان لەیاد بێت کەباری نێودەوڵەتی هەمیشە لەگۆڕان و ئالوگۆڕدایە، ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی تریشەوە دەزگاو دامەزراوە راگەیاندنەکانی بەرەی بەرامبەر بەئێمەو ئامێرو کەناڵەئاسمانی یەکان و سەتەلایت، کە ئێستا لەکوردستاندا باون دەستپێشخەری ئەوە دەکەن، سەرەرای ئەوەش دارشتنی هەواڵەکانمان لاوازو پڕ لەهەڵەن کە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی کادیر جابۆیە دەبێ دان بەوراستی یەدابنێین کە ئێمە لەم بوارەدا سەرکەوتوونین.

سێ هەم:-

پێش چەند ڕۆژێك دەمەتەقێ یەکی دۆستانەم لەگەڵ هەندێ هاورێمدا کرد، باسی سەربەستی ڕۆژنامەگەریمان دەکرد، بەتایبەتی ڕۆژنامەگەری کوردیی لەو باسەدا بووین بە دوو بەشەوە. هەندی لایەنگیری ئەوەی دەکرد کە ڕۆژنامەکانمان تاڕادەیەك جۆرە سەربەسی یەکیان هەیە، هەندێکی ترمان ئەو بیرەیان ڕەفز دەکردو دوو دڵ بوون لەئاستی دا.

سەرەکی فەرماندە دەفەرمووێ:- «ئێمە کە عیراقین بەندین بەهەموو شتێکی باشی عیراقمانەوە هەر بۆیە دەبێ بەندیش بین بەهەموو شتێکی ناپەسەندی یەوە، مەبەستمان لەم وتەیەی دوایی واتا لە ئاست راست کردنەوەی ئەو لایەنە ناپەسەندو نارەسەنانەدا جا ئەگەر هاتوو تەنها وەك سەیرکەرێك بەرامبەریان بووەستین ئەوا ئێمە عیراقی نین، هەربۆیە هەر سەیرکەرێك بەعیراقی دانانێم. .».

ئایا ئەم وتەیەی بەرێزی بواری ئەوەمان نادات کە جڵەوی پێنووسەکانمان بەردەین و بەتایبەتی دەبینین هەندێ ڕۆژنامەی عەرەبی لەعێراقدا بەرەنگاری زۆر لایەنی ناپەسەندی دام ودەزگا حکوومەتی یەکان و هەڵسوکەوتی نابەجێی هەندێ بەرپرسیارانی میری دەبنەوە، جا تاکەی ئێمەی کورد بەم گرێ کوێرە، ئالۆزەوە بتلێینەوە؟

یەکێك لە کۆسپە نەبینراوەکانی کاری ڕۆژنامە گەری کە لەراستی دا دیاردەیەکی هەست پێ کراوەو بەشێوەیەکی راستەوخۆ کاردەکاتە سەر بارو ڕەوتی بلاوکردنەوەو جۆری بابەتە بلاوکراوەکانمان، هەروەك کاردەکاتە سەر باری دەروونی و دەبێتە هۆی شپرزەیی و نائارامی هەندێ لە بەرپرسیارانی ڕۆژنامەو بلاوکراوەکانمان ئەمە سەرەرای باری

وربایی و چاودێری و چاوەڕوانی نارەحەتی بەردەوام، کەوا ئارەزوو دەکەین ئەم دیاردەیە بە «چاودێری کەری نهێنی..» یام «بەواهیمەی دەست کرد..». ناوی بەرین، ئەو چاودێری کەرە وەك واهیمەیەك واتەو بەزۆرور سەری هەندێ نووسەرو لێپرسراوی بڵاوکردنەوەدا هێلانەی ساز کردووە جاری واش هەیە دەکرێتە بیانوو تابە هۆیەوە هەندێ بابەت بڵاونەکەنەو.

دەوری ئەم چاودێری کەرە ڕەقیبە ئەوەیە کە ڕاپۆرتی نایاسایی و نارەوا بنووسێ، ئەگەرچی ئەو ڕاپۆرتانە لە بنیات دا هەر بەمردوویی لەدایك دەبن.

گەر ئەم چاودێری کەرە، بەکەسێکەوە یا چەندکەسانێکەوە بەندبێت، کەچی هەندێ نووسەرو لێپرسراومان وا دەیانخەنە روو کە جۆرە دیناسوورێکی بیرۆکراتین و لەبەردەرگای ڕۆژنامەنووسی کوردی دا وەستاون، یا دێوێکن بەرووی ڕای دیموکراتی یەوەو وتەکانی سەرەکی فەرمانلە لەبیر خۆیان دەبەنەوە.

بوونێتی ئەم جۆرە کەسانەو دوودڵی و ڕاراییی و ترسی لایەنی ئەوبەر کارێکی وا دەخوڵقێنێ کە هەندێ هەناسە بتاسێنرێ و هەندێ دەنگ بێ دەنگ بکرێن و نووسینەکانیان کە دوورە لەبۆچوونی چەوتی ئەوان ڕابگیررێ و بواری بڵاوکررنەوەیان نەدرێت.

لێرەدا دەپرسم و پرسیارم ڕووبەڕووی ئامادەبوان دەکەمەوەو دەڵێم ئایا لەماوەی ئەم دەساڵەی دوایی دا بیستوومانە یا دیومانە ئەدیب یا نووسەرو ڕۆژنامە گەرێکی کورد، بەهۆی نووسینی یەکی یەوە تووشی لێپرسینەوە، یا سزادان بوو بێت!!

لەئەنجامدا پێویستە لەسەر ئەوەی ئەرکی بەرپرسیارێتی لەبواری ڕۆژنامەگەری دا دەگرێتەخۆی، پێویستە چاونەترس و دڵ فراوان و باوەڕی بە دیموکراتی یەت بێت و ڕێز لەڕای کەسانی تر بنێت تا بەڕاستی لەئاستی ئەو شوێنەی خۆیدابێت.

## تەوەرەی سێ هەم :ـ

کۆسپەکانی لایەنی تەکنیکی و بەڕێوەبەرایەتی و دارایی، کە بەش بەحاڵی خۆیان دەبنە هۆی گیروگرفتەکانی ڕۆژنامەگەری لەدەرەوەی ناوچەی کوردستاندا؛ مەبەست پەیکەری تەقەنی و جۆری بەڕێوەبەرایەتی و دارایی یە کە بەشێکە لە پەیدابوونی لایەنی ناپەسەندو نارێك لە بواری ڕۆژنامەکانماندا.

پێش ئەوەی هەنگاو بنێینە ناو جەرگەی ئەم باسەوە کە خۆی لەنەبوونی کادیری شارەزای کوردیی پاش قوناغی ئامادەکردنی بابەتەکان خۆی دەنوێنێ واتاکادیری چاپ و تەصمیم.. لەم بوارەشدا باسی ئەم خاڵانە دەکەین:

١ ـ چاپ کردن و پیت ڕێکخستنی بابەتەکان :ـ چ نهێنی یەك نادرکێنین گەر وتمان گشت کادیری لەچاپ دان عەرەبن و بەهیچ جۆرێك کوردی نازانن، ئەوەش بێ گومان بەسەر باری گورج و گۆڵ کردنەوەو دەست و برد کردن و ئامادەکردنی زوو بە زوویی و ڕاستە و ڕەوانی لەچاپ دانی بابەتەکاندا دەشکێتەو.

٢ ـ هەڵە ڕاست کردنەوە:ـ لەبنەڕەتدا چاپکردن پیت ڕێك خستنی سەرەتایی پڕە لە هەڵەی چاپی، جا بۆیە دەبێت هەڵەڕاستکەرەوە دەورێکی تەواو لەڕاست کردنەوەی ئەو هەڵانەدا ببینێ. بەڵام جێی داخە کە بەگشتی کادیری هەڵەڕاست کەرەوەمان لەئاست بەرپرسیارێتی خۆی دا نی یە، یاخود شارەزایی یەکی ئەوتۆی لەبارەی زمانەکەوەنی یە ئەمەش ئاشکراو ڕوونەو وەك دیاردەیەك بەسەر رووی لاپەرەکانەوە بەدی دەکرێت، لەوانەشە ئەم دیاردەیە تارادەیەك بگەڕێتەوە بۆ کەمیی پاداشت.

٣ ـ کادیری تەصمیم، ئەوەی سەبارەت بە بەندی یەکەم گوترا، لێرەدا دووبارە دەکرێتەوە، ئەوەتا کادیری تەصمیم و جێ بەجێ کەر زوربەیان عەرەبن، یا کوردن و «کوردی نازانن». ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی ترەوە زۆربەیان شارەزایی یەکی ئەوتۆیانْ لەم بوارەدا نی یەو هەندێکیان ڕۆژنامەو گۆڤارەکانیان کردۆتە کێڵگەی تاقی کردنەوەو فێر بوون و ئەمەو سەرباری ئەوەی کە بەهۆی نەزانینی زمانی کوردی یەوە چ جۆرە لێك گەشتنێك لەنێوان ئەو کارەو ڕۆژنامەکاندا نی یەو بابەتەکان بەگوێرەی درێژی و کورتی تەصمیم و جێ بەجێ دەکەن هەر بۆیە چ جۆرە گونجانێك لەنێوان بابەتەکاندا نی یەو زۆر جار کادیری تەصمیم و تەنفیز بەشێك لەو بابەتە دەبرن تا بەگوێرەی ئەو شوێنەی سەر لاپەرەکە بیگونجێنن بەبێ ئەوەی خەمی ئەو پارچە براوە بخۆن، ئەمەو سەرەڕای زۆر جار ناوەڕۆکی ماددەکان پاش وپێش دەخزێن و هەندێ بابەت بەتەواوەتی دەشێوێندرێن.

هەرلەم بوارەشدا دیاردەی نەبوون یا لاوازی و یاکەمێتی مونتیف و وێنەی دەستی و نەگونجاندنیان لەگەڵ ناوەڕۆکی بابەتەکاندا بەدی دەکرێت.

٤ ـ کۆسپەکانی وێنەگرتن و دابەش کردنی ڕەنگ و مۆنتاژو قۆناغەکانی پلێت و کۆپی کردن و لەچاپدانی مەلزەمەو کۆکردنەوەی لاپەرەکان و ساحافی کردنیان و.. تا.. لەبەر ئەوەی کادیری ئەم زنجیرانە زمانی کوردی نازانن بەرەنگاری هەمان کۆسپ دەبینەوە.

٥ ـ کەم تەرخەمی کادیری چاپخانەکان و تەنانەت بایەخ بە ئان و کاتی دەرچوونی بڵاوکراوە کوردی یەکان نادەن و هەزارو یەك بیانوو دەدۆزنەوەو بەهانەو پەڵپی سەیر سەیر دەگرن، کە دواکەوتنی هەر بڵاوکراوەیەك لەکاتی خۆی لەڕاستگۆیی ئەو بڵاوکراوەیە کەم دەکاتەوە.

٦ ـ لایەنی دابەش کردنی ڕۆژنامەو بڵاوکراوە کوردی یەکان ئەوەتا ئەو لایەنانەی کە ئەرکی دابەش کردنی بڵاوکراوە کوردوی یەکانیان پێ سپێردراوە، کۆمپانیای نیشتمانی دابەش کردن یا هەندێ بەڵێندەری دابەش کردن کە لەپارێزگاکانی کوردستانەوە دێن وەك خاوەنی کتێبخانە تایبەتی یەکان.

ئەوەتا لەلایەنی دابەش کردنەوە بەگوێرەی بارودۆخی نائاسایی

ئەمرۆی کوردستانەوە، گەیاندن و دابەش کردنی ئەو بڵاوکراوانە زۆر لەکاتی خۆی دوادەکەوێت، ئەمەش کار لە بایەخی ئەوبڵاوکراوانە دەکات و بەتایبەتی ئەوبابەتانەی کە پەیوەندی یان بەکاروباری هەواڵ و شی کردنەوەو ڕاپۆرتی هەواڵی و ووتاری سیاسی سەبارەت بەکارو ڕووداوی ڕۆژانەو هەندێ چاوپێکەوتن و ریپۆرتاژەوە هەیە کە بە بۆنەی تایبەتی یەوە دەنووسرێن و پێویستیان بە ئان و کاتێکی تایبەتی و گورج و گۆڵ هەیە تابگەنە بەخوێنەر.

٧ ـ لایەنی کۆسپەکانی بەڕێوەبەرایەتی و دارایی کەئەمانەش بەش بەحاڵی خۆیان یاریدە دەری گرنگ و ڕاستەوخۆن لە گیروگرفتەکانی کاری ڕۆژنامەگەری داو لەهەندێ کاتدا بەشداری تەواوەتی دەکەن لە پەیدابوون ئەو کۆسپانەدا کە لێرەدا باسی ئەم خاڵانە دەکەین:ـ

أ ـ کەسی بەتواناو لێهاتوو شوێنی شیاوی خۆی نەگرتووە.

ب ـ کادیری ڕۆژنامەنووس لەیەك کاتدا سەربە چەند لایەك کاردەکات و لەلایەنی ئیداری یەوە بەچەن لایەکەوە بەندە کە ئەمەش لەوانەیە لەبەر کەمێتی کادیر بێ.

جـ ـ کادیری تایبەتی دەزگاکان سەرەڕای تواناو لیهاتوویی یان شوێنی شیاوی خۆیان پێ نەسپێردراوە، بەپێچەوانەوە متمانە دەکرێتە سەر ئەوانەی کە لەدەرەوەی ئەو بڵاوکراوانەدا کاردەکەن و بەشێوەیەکی کاتی لەوبڵاوکراوانەشدا کاردەکەن.

د ـ لاوازی کادیری باڵای ڕۆژنامەنووسی لەلایەنی ئیداری یەوە.

هـ ـ دیاری نەکردنی ئەرك و سەلاحی یەتی کارمەندان و کارکەرانی ڕۆژنامەو گۆڤارەکان وون بوونی ئەو دوولایەنە لەهەرزنجیرەیەکی کاردا.

و ـ کەلەکەبوونی کار لەسووچێکی تایبەتی دا وتەنانەت هەر بەدەست هەندێ کادیرەوەیە.

ز ـ نەبوونی بەرنامەو نەخشەی تایبەتی ڕێك خەری کاری ڕۆژانەی بڵاوکراوەکان و پشت بەستن بە کاری کاتیی و کوتوپری ڕۆژانەوە.

ح ـ وون بوون و شێواندنی هێڵی تایبەتی ڕاست و دروست بۆ چاودێری کردنی ئەوبابەتانەی کە دەنێردرێن بۆ بەشی لەچاپ دان، کە ئەمەش لەزۆر کاتدا کاری لایەنی «تحریر» دەئالۆزێنێ.

ك ـ کەم و کوری و ناتەواوی کاری خزمەت گوزاری و پێویستی یەکانی کار وەك «قاقەزوبابەتی یاریدەدەری نووسین و پێویستی یەکانی تەصمیم و. . .».

ل ـ کەمیی یا نەبوونی ئۆتۆمبێل کەکاری ڕۆژانە ئاسان دەکات.

م ـ لەلایەنی دارایی یەوە، ئەوەتا پاداشت ی تایبەتی بڵاوکردنەوەو کاری ڕۆژانە بەگوێرەی ئەم قۆناغەی ئێستامان زۆر لاوازو کەنەفتەو تەنانەت جێی مەرەکەب و پێنووس و کاغەزو هیلاکی گەیاندنی بابەتەکە ناگرێتەوە.

## دەرئەنجام:ـ

لەوسێ تەوەرەیەوە کە باسمان لێوەکردن دەگەینە چەند دەرئەنجامێك و، هەندێ کوسپمان بۆ ئاشکرا دەبێت کە لەوەدەچێ بووبنە دیاردەیەکی باوو نوێ لەبواری ڕۆژنامەگەریی کوردی دا، لەوانەش:ـ

### یەکەم ـ

دیاردەی دزین و دەست بەسەرداگرتنی هەندێ بابەتی ئەدەبی و زانستی و سیاسی. . دەتوانین ئەم دیاردەیە لەم خاڵانەدا کۆبکەینەوە.

١ ـ دەست بەسەردا گرتنی بابەتی وێژەیی و زانستی و لایەنی تر لەوانەی کە لەوەوپێش بەکوردی بڵاوکراونەتەوە، جا یا بەشێوەیەکی کوت وەت و دەقاودەقی یا بەهەندێ دەستکاری دیارەوە بەمەبەستی سەرلێشێواندن، ئەمەش لەلای هەندێ لەوانەی کە بەزۆر ناونراون (نووسەر) بەدی دەکرێت.

٢ ـ دزینی هەندێ بابەت لەزبانی ترەوە بەتایبەتی لەعەرەبی یەوەو بڵاوکردنەوەیان بەناوی خۆیانەوە.

٣ ـ دزینی هەندێ بابەتی عەرەبی، لەلایەن هەندێ لەوانەی کە دیاردەیەکی نوێ باون بەسەر نووسین و ڕۆژنامەگەری کوردی و عەرەبی یەوە کە لەراستی دا جۆرە هیماو دیاردەیەکی دروست کراون و چی لەزبانی کوردی نازانن و تەنانەت لە عەرەبیشدا چەوتن تاقە ئەرکی ئەوانە هە لبژاردن و دزینی دەقاودەقی ئەو بابەتانەیە لەرۆژنامەو گۆڤارو بڵاوکراوە عەرەبی یەکانەوەو بێ شەرمانە بەناوی خۆیانەوە دەینێرن یا وا خۆیان نیشان دەدەن کە لەزبانی غەیری عەرەبی یەوە وەریان گرتووەو وەریانگێراوە پاش ئەوەی کادیری ڕۆژنامەو گۆڤارەکان بۆیان دەکەنە کوردی و بەناوی ئەوانەوە بڵاودەکرێنەوە. . بەبێ ئەوەی ئاماژە بۆ ئەوە بکرێت کە ئەم بابەتە لە لایەن ڕۆژنامە یا گۆڤارەکەوە کراوە بەکوردی لەم ناوەشدا ماف وەرگێر دەفەوتێ. . ئەوەی شایانی باسە کە لەوەوپێشیش ئەم دیاردەیەمان لەڕێگای ئیداری یەوەو لە ڕێگای ووتارەوە باس کردووەو. . لە چەند بۆنەیەکدا دووپاتمان کردۆتەوەو لەسەرمان نووسی وە، کەبەرای من دیاردەیەکی فرە مەترسی لێ کراوەو ئەرکێکی قورسی کاتی یە بەسەر شانی ڕۆژنامەو نووسین و ئەدەبی کوردی و تەواوی باری ڕۆشنبیری کوردەوە لێرەشدا لەئاست چەند پرسیارێکدا دەوەستین.

ئایا ئەم جۆرە نیمچە نووسەرە دروست کراونە بۆچی بەعەرەبی دەنووسن، گەر زاراوەکەشمان پڕ بەپێستی خۆی بێت و بەنووسەر بژمێردرێن، بۆچ هەندێ نووسەر کە بەنلەش یەکێکە لەوانە ئەو جۆرە بابەتانەیان بۆ دەگۆڕنە سەر زبانی کوردی یاخود بە عەرەبیش بۆیان دەنووسن؟!!

٤ ـ سەرەڕای هەموو ئەمانەی کەباسمان لێوەکردن کارێکی مەترسی تر لەئارادایە، کەئەویش ئەو جۆرە (نووسەر) انە ناوەکانیان لەگەڵ ئەو بابەتانەدا دەردەچێ بەبێ ئەوەی ئاماژە بۆ ئەوەبکرێت کە ئەو بابەتانە

لەلایەن رۆژنامە یاخود بڵاوکراوەکەوە وەرگێراوەتە سەر زبانی کوردی بەم جۆرەش، ئەو جۆر، (کەس) انە بەسەر لاپەرەکانی مێژووی ئەدەب و نووسەرو رۆشبیران کوردەوە دەنووسرێن و والەقەلەم دەدرێن کە رۆژنامەنووس و نووسەری کوردن و خزمەتی زبان و وشەی کوردیان کردووەو لەهەمووان سەیرتریش هەندێکیان هەیە بە هەردوو زاراوەی سۆران و کرمانجی بابەتیان بۆ دەکرێتە کوردی و بڵاودەکرێتەوە.

## دووهەم:-

بەرامبەر بە خاڵی یەکەم کەلەسەرەوە باسمان کرد هەندێ نووسەری کورد یاخود تازەپێ گەیشتوو هەن ئەگەر چی بەرهەمەکانیان ناکامڵ و ناتەواوەو لەلایەنی زمانەوانی یەوە یا لە لایەنی دارشتنەوە، لەوانەیە پێویستی بەدەست کاری یەکی کەم هەبێ تا بۆ بڵاوکردنەوە بشێ.

یاریدەدانی ئەم جۆرە نووسەرانە کارێکی پیرۆزە.

## سێ هەم:-

نەخوێندنەوەی زۆربەی بابەت لەلایەن دەستەی نووسەران یا لێپرسراوی بڵاوکردنەوە ئەمەش بەئاشکراو روون لە هەڵەی زمانەوانی یەوە بەدی دەکرێت.

## چوارەم:-

بڵاوکردنەوەی هەندێ بابەت کە لەوەوپێش لەهەمان بڵاوکراوەدا بڵاوکراوەتەوە.. یاخود لە لەبڵاوکراوەیەکی ترەوە بەشێوەیەکی دەقاودەقی تەنانەت لەلایەنی (تەصمیم) یشەوە، بەوەشا دەردەکەوێت کە ئەو رۆژنامەیەی پێشووە براوەو خراوەتە سەر لاپەرەی ژمارەکەی تر ئەم دیاری دەیەش تاپێش پتر لە ساڵێك بەردەوام بوو لەکاتێکدا بڵاوکردنەوەی هەمان بابەت لە زیاتر لەرۆژنامەو گۆڤارێکدا هێشتا باوو بەردەوامە..

## پێنجەم:-

نەبوونی لاپەرەی رۆژانەو هەفتانەی بەردەوام و ئەگەر ئەو جۆرە لاپەرانەش هەبن ئەوا لەکاتی خۆیاندا دەرناچن ئەمەش بەسەر عەموودی رۆژانەدا دووپات دەبێتەوە ئەم کارەش لە راستگۆیی نووسەرو بڵاوکراوەکە کەمدەکاتەوەو ئاست و پایەی لەلای خوێنەر نامێنێ.

## شەشەم:-

بایەخ نەدان بەهەڵە راستکردنەوە. بەهۆی لاوازی کادیرو کەمێتی پادداشتەوە.

## حەوتەم:-

بەك نەخستنی رێنووسی کوردی، سەرەرای هەڵەی زمانەوان و لاوازی دارشتنی زۆر ووتاری بڵاوکراوە.

## هەشتەم:-

شێواندنی هەندێ بابەت لەکاتی تەصمیم کردنداو پاش و پێشخستنی برگەکانی و شێواندنی ناوەرۆکی..

## نۆیەم:-

دوو دڵی و دڵەلەرزێی هەندی بەرپرسیا.. لەئاست بڵاوکردنەوەی هەندێ بابەت ولێکدانەوەیان بەگوێرەی بۆچوونی تایبەتی خۆیان.

دەیەم:- نەبوونی دیاردەی رەخنە بەسەر لاپەرەی رۆژنامەو بڵاوکراوەکانمانەوە ئەوەی هەشە زۆربەیان لایەنی ناکۆکی شەخسی دەگرێتە خۆی.

## ئەنجام وپیشنیارەکان

ئەوەی باسمان کرد تەنها بمەبەستی رەخنەی بیناکاری یەوە بوو مەبەستمان راستی یە پەتیەکەیە بێ چ فرت وفێڵ و ئارایشت ومۆنتاژکردن.. هەربۆیە هەندێ ئەنجام و پێشنیار دەخەینە روو هیوادارین هەموو لایەنە پەیوەندی کارەکان بەجدی وەری بگرن و بایەخی پێ بدەن و جێ بەجێی بکەن تا چەند هەنگاوێکی راست بە رۆژنامەگەری نیشتمانیی کوردمان بەرەو دوور خستنەوەی دەسەڵاتی راگەیاندنی رۆژئاوا بنێین و هاوبەشێکی شان بەشانی بەهێزو بەتوانایین لەتەك رۆژنامەو بڵاوکراوەکانی ئێستای ناوچەی کوردستان و لەئەنجامدا هەست و نەست و بیری خوێنەری کورد بەووتەو کردار بەلای خۆماندا رابکێشین ئەوا بەکورتی ئەو خاڵانەش دەخەینە روو.

١ - پەیرەوکردنی کاری بەکۆمەڵ و سەرپەرشتی کردنی بەکۆمەڵ و دوور کەوتنەوە لەرەوتی بریاردانی تەنها کەسی.

٢ - پەیرەوکردنی رەوتی دابەش کردنی کار ئەم خاڵەش دەرئەنجامی خاڵی یەکە:٩.

٣ - داپین کردنی باری بەرپرسیارێتی و هەڵتەك و داتەك پێ نەکردنیان و کەسانی بەتواناو لێهاتوو لەشوێنی شایانی خۆیاندا بهێلرێنەوەو تەنانەت دەست بەباڵیانەو بگیرێ بەرەو شوێن و پلەی بەرزترو لەم کارەدا سوود لە کادیری مووچەخۆری دەزگا وەربگیرێ و پەنانەبرێتە بەر کادیری کاتیی.

٤ - پێ بەخشینی دەسەڵات و دیاری کردنی ئەرکی سەرشانی ئندامانی سەرپەرشتکار یا سەرپەرشتکارانی لاپەرەکان و سکرتاری یەتی نووسین و زنجیرەکانی نووسین و دیاری کردنی ئاست و شوێنی

کارمەندانی بەڕێوەبەرایەتی و هەر یەکی لە پلەکانی کادیری بەرهەم هێنان و ئامادەکردن..

٥ - پەنابردنە بەر سەپەرشتکارێکی زمانەوانی بەمەبەستی چاودێری کردنی لایەنی زمانەوانی و تەرخان کردنی پاداشتێکی باش بۆ هەر یەکێ لەوانە چونکە کارێکی مەزنی مێژوویی هەڵدەسوورێنن و زمانەکەمان دەپارێزن..

٦ - چاونەترسیی و دوورکەوتنەوە لە دوودڵی و ڕاڕایی لەکاتی پەیڕەوکردنی بابەتەکان و پەسەنەکردنیان.

٧ - دوور کەوتنەوە لە ئارەزوو ئارەزووکاری و مەبەستی شەخسی لە پەسەندکردن و بڵاوکردنەوەی مادەکاندا بەتایبەتی ئەوبڵاوکراوانەی ئێستا لە مەیداندان هی میللەتن..

٨ - ئاکادیرەکانمان چاوکراوەو ئاگاداری ڕووداوەکانی ناوچەی کوردوستان و ڕاگەیاندنی ئەو لایەنانە بن پێویستەچاو بە ڕۆژنامەو بڵاوکراوەکانی ناوچەی کوردستاندا بخشێنن و بیانخوێننەوەو سوودیان لێ وەربگرن تابتوانن ڕای گشتی ئاگادار بکەنەوە لێرەدا شتێکی نهێنی ناخەمە ڕوو گەر وتم. کادیرەکانمان تەنانەت چاویان بەگۆڤارو ڕۆژنامەکانی بەغداش ناکەوێت و ئەوبڵاوکراو انانەیان بۆ ئامادەناکرێت..

٩- پێویستە دەزگا کوردی یەکان ئامێری نوێی تەلەفزیۆن و سەتەلایتیان هەبێ هەر وەك چۆن دەزگا هاوچەشنە عەرەبی یەکان ئەو جۆرە شتانەیان هەیە ئەمەش بەمەبەستەوە تابتوانن لایەن و کەلێنێکی فراوان لەرۆژنامەگەری کوردی دا پڕبکەنەوە.

١٠ - گەڕان بەشوێن کادیری کورداو بەتایبەتی بۆ زنجیرەکانی کاری هونەری و تەقەنی و مەشق پێ کردنیان و ئامادەکردنی تەواویان بۆ ئەو جۆرە کارانەو تەرخانکردنی مووچەیەکی باش بۆ هەر یەکێکیان.

١١ - پێویستە بەشی وێنە گرتنی فۆتۆگرافی لەدەزگا کوردی یەکاندا دامەزرێ.

١٢ - ئالەم ئان و کات و شوێنەوە بەتەواوەتی ئیتر بیرای بیرای بواری چ بابەتێك نەدرێ کە بەزبانی عەرەبی نووسراێ بەتایبەتی ئەوجۆرە بابەتانەی کە مەرایی و ڕیایی یەکی ئاشکرایان پێوە دیارە.. دەبا ڕێز لە خۆمان بنێین، چونکە نووسەری کورد توانای بەخشش و داهێنانی پتر و پترتری لەباردایە.

١٣ - هاندانی بابەتی ڕەخنەسازیی ڕاست و ڕەوان و تەرخان کردنی پاداشتی تایبەتی بۆ ئەو جۆرە بابەتانە.

١٤ - هاندانی نووسەرە نوێ باوو تازەپێگەیشتووەکان و پەیڕەوکردنی بابەتەکانیان و بڵاوکردنەوەیان وتەرخان کردنی پادداشتێکی باش بۆ ئەو بابەتانەیان.

١٥ - ڕاگرتنی بڵاوکردنەوەی بابەتی زانستی و ئەوانەی کە هاوچەشنی بابەتی قوتابخانەن و پێویستی یان بە پسپۆری یەکی ووردو تەواو هەیەو ئەوبابەتانەی کە زۆر دوورو درێژن و بەزنجیرە ووتارێك بڵاودەکرێنەوە چونکە ئەم بابەتانە بەدگمەن سەرنجی خوێنەر ڕادەکێشن و شوێنی تایبەی خۆیان هەیە بۆبڵاوکرونەوە وەك گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ.

١٦ - پێویستە ڕۆژنامەگەرێکی کورد یا سەرۆکی نیقابەی ڕۆژنامە نووسان لقی کوردستان بکرێتە ئەندامی دەستەی بەڕیوەبەردنی نیقابەی ڕۆژنامەنووسانی عیراق.

١٧ - بەخشین و داشکاندنێکی باش بەو لایەنانە بدرێ کە ئەرکی دابەش کردنی ڕۆژنامەو بڵاوکراوەکانیان گرتۆتە ئەستۆ تا گەیشتنی زوو بەزوویی ئەو بڵاوکراوانە بەخوێنەر زامن کەین.

١٨ - پێویستە ڕۆژنامەگەری کورد بەشداری لە هەر کۆنگرەی ڕۆژنامە گەری و چالاکی یەکی میری و نێودەوڵەتی دابکات.. هەروەها پێویستە بەشداربێت لە هەر دەورەیەکی مەشق پێ کردن و هەر ناردنە دەرەوەیەك بۆفێربوون یا ئامادەبوون لە جۆرەها چالاکی دا.

لەکۆتایی دا سوپاسی دان بە خودا گرتنی درێژخایان و گوێ سووك کردنتان دەکەم.

## ملخص البحث

# ملاحظات حول واقع الصحافة الكردية

ملاحظات حول واقع الصحافة الكردية

احمد زەردەشت

يتضمن البحث محورين اساسين حول واقع الصحافة الكردية وهما:

١ ـ الواقع الحالي للصحافة الكردية الصادرة في منطقة الحكم الذاتي.

٢ ـ الواقع الحالي للصحافة الكردية الصادرة خارج منطقة الحكم الذاتي.

حيث يتطرق الى العوامل التي تؤدي الى نجاح الصحافة الكردية في منطقة كردستان وما في ذلك من دور الاجهزة الاعلامية الغربية في الترويج واغناء المتلقي، ومن خلال عرضه للمعوقات التي تعاني منها الصحافة الكردية خارج منطقة الحكم الذاتي وتصنيفه لتلك المعوقات بثلاث محاور رئيسية وهي:-

١ ـ المعوقات الخاصة المتعلقة بالكاتب والنص الكردي.

٢ ـ المعوقات الخاصة بالتحرير وما يدخل ضمن نطاق هذه العملية من تحرير واعداد وترجمة وتقييم.

٣ ـ المعوقات الفنية والادارية والمالية، وما يتعلق بالعملية الطباعية.

فقد توصل الباحث الى بعض الاستنتاجات التي بنى عليها نتائج بحثه، بهدف الوصول الى مطبوع اجود يمكن ان يثبت له موقع قدم راسخة في الساحة الكردستانية وبجدارة فائقة.

# خوسرەو جاف و جیهانی ئەدەب



سالار اسماعیل حسین کوجان

(پێشەکی)

لەتەمی مژی بەرەبەیان پرسیار کرا.. بۆچ وا دۆش داماوی...؟ هەڵزقایەوە..! ووق

بەتەمای گزنگی ئاڵتونی بریقەداری بەرە بەیانێکم لە دەشتی کاکی یەکاکی (گەرمیان)ە هەڵ قرچاوەکە پرسیار کرا..؟ بۆچ واهەڵ کروزاوی..؟ لە چی بیر ئەکەیتەوە..؟
بارانیکی بەلێزمە. یان رهێلە.

بەڵێ لە مێژوەو وەك نووسەرێك. خولیای بیرکردنەوەو تامەزرۆی. رونکردنەوەیەکم. دەربارەی ئەدەبیاتی خوسرەو جاف. وائێستا بەوە شادبومەوە... یەکەم شت هانی دام (کوردەرە)بوو. کاتێ لە تەواوکردنی رۆمانەکەدا بووم. مێشکە چیرۆك دۆستەکەم. کەوتە چەخماخە لێ دانێکی بێ وچان. بەتایبەت کاتی هەڵس و کەوتم لەگەڵ کەسانی رۆمانەکەدا کرد. کە ئەمبینی (داڵکە)ی[1] ئەکبر خەریکی کردنەوەی ئەوگرێ کۆنە چەند ساڵەیە بەڵام بۆی ناکرێتەوە. هەرچەند ئەکا زەردە ژانەکەی ناخی ریشە کێشکا. سەرناکەوێ وبەتایبەت لە کاتێکدا کەلوپەلەکانی ئەکبەرو رەزای کوری ئەداتە بەر پێتەی دەستی و رەوانەی قوتابخانەیان ئەکا. کورەکەی عەبە کولەکە سەریش بە پانتۆڵی ئنگلیزیەوە. خەریکی لان لێ دانە یەکسەر هەستێك لە مێشکمدا برووسك ئاسا. چەخماخەی دا بۆ نووسینی ئەم لێکۆڵینەوە ئەدەبییە.. لەبەر ئەوەی نووسەر لایەنگیری قوتابخانەی (واقعیەت)ە لە نووسینەکانی دا ولەبەر ئەوەی مێشکی هەمووان خەمخواری دەردو پەژارەی خەڵکەکەی تۆلەکە فرۆشی کۆردەرەن. هەر وەك تیۆدور (دیستۆفیسکی) مەزن ئەڵێ (واقعیەت مانای مێشکی هەمووان. یان زۆربەی خەڵك)[2] دووهەم هۆی نووسینەکەم (هەڵبەستی. رازی ئەزەل) کاتێ لەسەرەتاوە دەستم پێ کرد رەگ و ریشەی مێشکم بەدەور وشەکان ئۆقرەی گرت. چۆن نەفرەت لە (هومیرۆس)[3] ئەکا لەبەر ئەوە ژان و زەیزەفونەکانی رۆژهەڵاتی لە بیر چووەو. تۆماری نەکردووە.

دواهۆی نووسینەکەم ئەوەیە کە شارەزاییەکی زۆرم هەیە لەو ناوچەیەی کە نووسەر کردویە پرکەرەستەی زۆربەی نووسینەکانی. ئەتوانم بڵێم بەشدارم لە زەردە ژانەکانی نووسەرو ژانە تاڵەکەی ناوچەکە.. ژانەکە لە ناخدایە لە مێژەوە بێ رەحمانە خوێنی رەگ و ریشەی دەروونم هەڵ ئەمژێ.

جیهانی ئەدەب. دەریایە.. ئۆقیانووسە بیابانێکی بێ سنورە. ئەوەش تامەزرۆی ووشەی ئەدەبی پڕ حەقیقەت بێ. لە نێوان ژانی گەل دا ئەتلێتەوە. لەناخەوە هەست بە هەژاندنێکی بێ وچان ئەکا.. ئەدیبی راستی و نیشتمان پەروەر ئەبێ کەشتی خۆی تاودا لە دەریای واقعی یەتدا. ئەبێ ئەو خەڵکی نازناوی ئەدیبی بۆ هەڵ بژێرن. نەوەك بەسینگ دەرپەڕانی خۆی و هەوڵدانی پرکردنی هەگبەکەی. مەبەستم تیرو توانج نی یە. لەبەر ئەوەی خۆشم لە گۆمی قوڵی بێ بنی ئەدەب دا. خەریکی مەلەوانی یەکی بەردەوامم. ئەوسا ئەڵێم ماوەمە. جا لێرەدا ئەدیبی راستی ئەبێ مل کەچ بێ بۆ واقع و حەقیقەت. راستی تەنها رێگایەکە مرۆڤ شادبکاتەوە بە ئەنجامێکی روون و ئاشکرا. ئەدیب.. دانایە.. زانایە. وتەکانی گەوهەرە. ئەبێ نەیهاوێژی وەك تیری بێ نیشان ئەوەی لە زاری دێتەدەر بەرامبەر بە مێژو بەرپرسیارە دوا رۆژ.

چیرۆك نووس و شاعیرو رۆمان نووس. هەروەك هەموو ئادەمیزادێك لە شارێکی گەورە. لە شارۆچکەیەك. لە کوێرە دێ یەك.. لە پانتایی بیابانێکا لە ژێر دەوارێکی رەشا. لە دۆڵێکی نێوان دوو چیای سەرکەشا. چاو هەڵ دێنێ خۆی و ناوچەکەی و نیشتمانەکەی ئەناسێنێ لە هەمو جیهاندا.

کەڵەشێری بەیانی کوێرە دێ ی (چوقور ئۆیا)[1] مژدەی لەدایك بوونی نووسەری بەناوبانگ و باوکی رۆمان چیرۆك (یەشار کەمال)ی بۆ خەڵك بڵاوکردەوە. بوو بەو نووسەرەی کە شاکارەکانی بە چەندەها زمان بڵاو کرایەوە. شارۆچکەی (هەڵەبجە)ی دامێنی چیای هەورامان (گۆران)ی مەزنی ختەوە. کوێرە دێ ی (جیکۆر)[2] خواروی نیشتمان (سەییاب)ی بلیمەت و قوتابخانەی حەقیقەتی وەبەرهەم هێنا.. کۆڵانە تەسك و تاریکەپێچاو پێچەکانی شارۆچکەی (کفری) دامێنی چیا سەرکەشەکەی باوەشاسوار[4] (لەتیف هەلمەت)ی زەحمەت کێش و ئەڤینی ووشەی کوردی و. نیشتمان پەروەری وەدەسی هێنا...

ئەمرۆش بۆ ئەم لێکۆڵینەوە ئەدەبی یەی وا بەدەستمەوە. ئەبێ ئەو مەرەکەبەی لە گەرووی پێنووسەکەمدایە زۆر لەسەر خۆو ئاگاداری بم

نەوەك بەشی نووسینەکەی ئەو کەڵە نووسەرەی شارۆچکەی (کەلار)ی[6] دەشتی گەرمیان نەکا. بەڵێ.. (خوسرەوجاف)پێش ئەوەی بڵێم پێش ئەوەی و بەشان و باڵیدا هەڵ دەم. کە لە بەگ زادەکانی هۆزی

جاف گەلی کوردە. . . ئەڵێم لە بنەماڵەیەکی ووشەی کوردی پەرستن.
لە باوك و باپیرەو هاودەم و هاوسەری ئەدەبی کوردی بوون خوسرەو لە
دێ ی (کەلار)ی کۆن سەربەقەزای کفری ناوچەی گەرمیان چاوی
هەڵ هێناوە. . ئەو گەرمیانەی کە لە دێرزەمانەوە گروگڵپەو بلێسەی
ناکوژێتەوە. بەبۆچوونی خۆم تەمەنی دەرگای پەنجا ساڵی ئەکوتێ. کورە
گەورەی ئەدیب و روشنبیری بەناوبانگی کوردی مەحەممەد[٧] سەعید
جافە. حەمە[٨] پاشای جاف باپیرە گەورەیانە. ئێستا دانشتوی شاری
بەغدایە. . ئەندازیارێکی میعماری سەرکەوتووە.

خوسرەو هەتا کۆتایی شەستەکان سەرقاڵی کاری رامیاری کوردایەتی
بوو. لە سەرەتای هەفتاکانەوە خۆی هەڵ دایە دەریای ئەدەبی لەبن
نەهات و ئەدەبی کوردی بواری زۆری بەخۆیە کردوە. .

شیعرو چیرۆك نووسین و رۆمان و پەخشان ووتار نووسین. . .
هتد

## (نووسەر لەبواری ئەدەبدا بەگشتی)

خوسرەو جاف لە غاوی ئەسپی خۆی شل کردوەو هەردوو پێ ی لە
ئاوزەنگی توند کردووەو ژێر سکی ئەسپەکەی جۆرەی دێ لە ئارەقەی
سپیدا. . جاری بەرەو رۆمان نووسین و تاوێك بەرەو چیرۆك
نووسین و زۆر جاریش بە شیعرو لە پەخشان نووسینیشدا بەردەوامە.
ماوەیەکە خولیای ئەدەبی کوردیم جار جارێك لە بواری چیرۆك
نووسین دا خەریکم. زۆر جار پرکێشی ناکەم بڵێم نووسەرم.

لە ژیانم دا حەز لە پاشقولدان و بریندارکردنی هەستی هیچ کەسێك
ناکەم. تەنها رەخنەی ئیجابی نەبێ (النقد البناء) بە بۆچونی من ئەگەر
خوسرەو لە بواری چیرۆك نووسین و رۆمان کاری بکردایە. لەبەر
ئەوەی چیرۆك نووسین و رۆمان نووسین تەواوکەری یەکن. دوور
نی یە چەنێ ساڵێکی تر بەشانازی یەکەو ترسی ئەوەمان نەبوایە کە بڵێین
لەوە ئەچێ لە گەرمیانی لای ئێمەشدا یەشار کەماڵێ سەری هەڵ دایە.
ئەم بۆچونەم شتێکە لە جیهانی ئەدەبیدا ئەبێ بیڵێم. هەروەك رەخنەگر (تی
سی ئیلیوت) [٧] ئەڵێ:ـ

(رەخنە شتێکە وەك هەناسەدان. . ناتوانی خۆتی لێ لادەی)

## (رۆمانەکانی نووسەر)

نووسەر کاتێ کە رۆمانەکەی دەرچوو بە ناونیشانی (کۆردەرە) لە
نەوەتەکانا. بەشێ لە نووسەران توومەتی ئەوەیان بۆ دروست کرد کە لە
رۆمانی (ئاب شۆران)ی[٩] عەلی ئەشرەفی یانە[١٠] وەری گرتووە.
بەشێکیش زەحمدارتریان کردو ئەیانگوت فارسی یەکەیە و کردویەتە
کوردی. هەرچەندی بێ هیچ شاردنەوەیەك خۆی ئەیگوت
سەرکەوتنەکەم لە کۆردەرەدا ئەگەرێتەوە بۆ ئاب شۆران. دوای رەخنەو
رەخنەکاری و دەمەقاڵەی زۆر لە ئەدیبان. لێکۆڵینەوەیەکم نووسی بە ناو
نیشانی (پیاچونەوەیەکی درەنگە وەخت بە کۆردەرەدا) لە رۆژنامەی
هاوکاری بڵاو کرایەوە. بۆم دەرکەوت کە نووسەر خاوەنی بڕوایەکی
گەورەیە بە خۆی. رۆژگاریش تاقی کردنەوەیەکە بۆ توانای هەموو
نووسەرێك. ئەدەب و دوا بە دوای کوردەرە رۆمانی (هیچ)ی[١٠] دەرچو
ساڵی ١٩٩١و رۆمانی (گەماڵی)[١١] دەرچو ساڵی ١٩٩٢و رۆمانی
(پاشایان کوشت) ساڵی ١٩٩٣. رۆمانی (راز)ی دەرچو وکتێبی (دائرة



المعارف)ی دەرچو. ئەمەش جگە لەو هەمو چیرۆك و پەخشان و
کۆمەڵە شیعرانەی کە لە گۆڤارو رۆژنامە کوردی یەکان بڵاو ئەبێتەوە.
ئەم هەمو بەرهەمانە بەڵگە نامەیەکی گەورەیە بە دەست نووسەرەوە
بەرامبەر ئەو کەسانەی کە لەپێشدا بەربەرەکانی یان ئەکرد لە گەڵیدا.
دەربارەی بڵاوکراوەکانی ئەتوانم بڵێم خوسرەو جاف تەقینەوەیەکە لە
جیهانی ئەدەبی کوردیدا لەم چەرخە. ئەوەش نی یە بەشان وباڵیدا
هەڵدەم. بەوشەی کوردی. . ئەم ووشە کوردی پەرستە هەتاك و ئێستا
هیچ جۆرە چاو پێ کەوتن و دانشتێکم لە گەڵیا نەکردوە. هەتا نووسینی
ئەم لێکۆڵینەوەیە. . ئەتوانم بڵێم هەمو بەرهەمەکانیم خوێندۆتەوە
لەرۆمانیان یەوە هەتا شیعرەکانی و پەخشانەکانی لە گۆڤارو رۆژنامە
کوردی یەکانا.

## (بەشێ لە نووسینەکانی لە گۆڤارو رۆژنامەکاندا)

چیرۆکێکی بە ناو نیشانی (هایدە)[١٢] لە بەیانی ژمارە ١٦٦ ساڵی
١٩٩٠ هەرچەندێ چیرۆکێکی مێژوویە بەڵام بە شێوەیەکی جوان
دایرشتوە. کە چۆن (رامدیس) سەرۆك سوپای فیرعون لە وڵاتی

میـسردا ئەکەوێتە ئەوینی (هایدە)ی کەمان ژەنی کچی پاشای حەبەشەوە. لە کۆتایی دا بەشێوەیەکی رۆمانسییەت بێ رەحمانە فیرعەون لە ناویان ئەدا. لەم چیرۆکەدا وردەکاری و تەکنیکێکی جوانی بەکار هێناوە.

لە کۆتایی هەشتاکانا دەزگای رۆشنبیری وبڵاوکردنەوەی کوردی بۆ یادی کۆچی دوایی فەیلەسوفی بە تواناو سۆفی شـاعیرانی کـورد (مەولەوی) ئازیز. کۆبونەوە و سیمینارێکی شیعری ساز کرد لەگەڵ مامۆستای خوالێخۆشبوو (مصطفیٰ نریمان)و ئەدیب و چیرۆك نووسی بە توانا کاك (احمد محمد اسماعیل) رۆیشتین بۆ سولێمانی لە هۆڵی مامۆستایاندا دوا بە دوای شاعیری نەمری خوالیخۆشبوو حسیب قەرەداغی کاك خوسرەو جاف چەن کۆپلەیەك شیعری خوێندەوە بەراستی خۆی و شیعرەکانی بوون بە سرنج راکێشەی دانیشتوان. لەو رۆژەوە لە دڵدا جێگای خۆی کردوەتەوە...

نووسەر لە بواری پەخشان نووسیندا دەسیکی باڵای هەیە. ئەمەش پارچەیەك پەخشانیەی بە ناونیشانی (مەنیژەگیان)[٣] کە لە بەیانی ژمارە ١٤٧ ساڵی ١٩٨٨ دەرچوون.

(جوانکیلەکەم... لە روخسارو گلێنەتا لەرزو تایی حەزو ترس دەبینم دیتم وە لێدانی خورپەی دڵ چو تەپڵی هەی سوار هەی سواری لەشکری بەرزە دەماخ دێتە گوێم... تۆیش لێوەکانت توێژی هەڵهێناوە و لێوە لەرەیانە وەك دوو لێوی زامێکی دەم کراوە بێ هاوار شاتۆی ژان و ژوان و ژین و شیوەن ئەگێرن...!).

لەم پەخشـانەدا نـووسەر بـەوردەکاری یـەکی جوان و. بـەوە سایانەیەکی بەراستی وەسا. وەسفێکی پر مانا. تەنها گۆرانی مەزن توانیویەتی بە سروشتا یان بەدەزگیرانەکەیدا ئە ئاوها هەڵدا. وەك ئەڵێ..

گۆران

قـژکـاڵی... لـێـوو ئـاڵی. پـرشـنگـی نـیـگـا کـاڵ
ئـەی کچە جـوانـەکـەی سەر گـۆنـانـە خـتـێك ئـاڵ
ئـەی ئـەنـدام وردیلەی، نـەرمـۆڵـەی ئیـسـك سـووك
ئـەی بـەرگی سـاکـاریت دڵگیـرتـر لـە هی بـووك

خوسرەو جاف وەسفی جوانکیلەکەی ئەکا.. کاتێ کە رووەتی لەگەڵ گلێنەی چاوەکانیدا ئەبینێ خۆشەویستی و ئەوینی دڵداری دێنێتە لەرزە. خورپەی دڵ و دەروونی بە گوێی خۆی ئەبینێ. ئەمجارە ئەگەڕێتەوە بۆ دەزگیرانەکەی و ئەڵێ. کورەی بڵێسەداری ئەوینی تۆیش لێوەکانت کەوتنە لەرە لەروو لێ رەدا سووری لێوەکانی تەشبیە ئەکاتە زامێکی دەم نوشتەر چۆن دوای ماوەیەکی کەم توێژ ئەگرێ و دەم ئەداتەوە. زۆر لەسەر خۆ بێ هاوار داوای هەڵ مژین و ژوانم لێ ئەکەن.

نووسەر نووسینی زۆرە بەڵام ئەو نووسینانە کە لەم لێکۆڵینەوەیەدا باسی ئەکەم بە لای منەوە شایەنی باس کردنە. زۆر جاریش بە نووسینی مام ناوەندیەوە خۆی خەریك کردووە.

نوسینێکی لە گۆڤاری ألف باء بە ناو نیشانی (المزمار) بە زمانی عەرەبی بڵاو کرایەوە بە شێوەیەکی جوان باسی موعاناتی زورنا ژەنێك ئەکا کاتێ کە سەر دائەنوێنێ بۆ پارەیەکی کەم لەبەر دەرگای هەمو ماڵێکدا.

نووسەر لە نووسەری کورد ژمارە (٩) ساڵی ١٩٩٧ پـارچە شیعرێکی بە ناونیشانی (نەورۆز و من و ئازیزەکەم) بڵاو کردەوە..

ئازیزەکەم بجوڵێ راپەڕە هەستە لە خەو
ئەی کۆیلە کەنیزی هەزاران ساڵەی ئەمو ئەو.
حەزو ئاواتم رەوایە.
گەر جادوگە بامایە
دەم کردە دیاری.. دڵداریێ
دوکەڵ و تەم.. بۆ سەرپەرچەم
بۆ غەمچنی لەسەر خۆسەر
لەچك لە هەور
گێل گێلەشت لە ئەستارە
خۆرم دەکردە گوارە
ملوانکەیەك لە چەنەختە
مانگم ئەکردە کڵاو زەر
ئا کویلە کەنیزەی ئەم ئەو
راپەڕە هەستە لە خەو

لێرەدا هەستی هەژاندویەتی بەرامبەر نەورۆزو خۆشەویستەکەی ئەیەوێ دووکەڵەکەی بکا بە سەرپەچەم لە خۆریس گوارە و لە مانگیش کڵاوێکی زێرین و هەستارەکانیش بکا بە رێزێ گێل گێلە. جا لێرەدا سەیری ئەم تەشبیهە جوانەکە کە خۆشەویستی نەورۆزو ئازیەکەی کەمەن کێشی ئەکەن و بە جوتە ئەبن بە حەزو ئاواتێك و ئۆقرە ئەگرن لە دڵ و دەرونیدا.

بە درێژی هەڵـسەنگاندنی هەڵبەستەکەی
بە ناو نیشانی (رازی ئەزەل)

ئەمەوێ لە کاك خوسرەو دەرگای (رازی ئەزەل)ی بۆم واز کا کە لە ژمارە (١٠٨) رەنگینی کانونی دوهەم ١٩٩٨ دەرچووە. ئەوا دەرگای وازکرد و خۆم کرد بە ژورا... لەم پارچە هەڵبەستەدا شاعیر ئەیەوێ هەمو ئەو نووسینە کلاسی کانەو هەمو ئەوانەش کە بە پێنووسی خۆیان دەربارەی رۆمانسییەت دواون هەر هەمووی لولدا و بیدا بە دەم گەردەلولە پێچاو پێچەکانی دەشتی گەرمیان و ئەسپی شەکەت نەبوی ئەدەبی خۆی تاودا بەرە و قوتابخانەی شیعری واقعی و حەقیقەت. ئەیەوێ بە گژی مێژودا بچێ لەبەر ئەوەی بە چاوێکی یەکسان تەماشای مرۆڤەکانی ئەم سەر زەمینەی نەکردووە لێرەدا ئەڵێ..

یەکەمین تروسکە یەکەمین گڕ

یەکەمین سر یەکەمین هەتاو
یەکەمین هاڵاو تیشکی هەتاو
یەکەمین شنە یەکەمین باران
یەکەمین کەفی هەورو یەکەمین ئاسمان
یەکەمین ئای ساوای مێژو
لە تاریکیدا بێ چرا لای ئێمەی کورد تۆمار کرا.
دێ ی پێکەوە پێشکەی مێژو بسوتێنین
لە کوانوی حەقیقەتا گڕی گەورە هەڵگیرسێنین..؟

لێرەدا شاعیر مەبەستی ئەوەیە کە سەرەتایی مرۆڤایەتی و شارستانییەت و جوانی سروشت لە رۆژهەڵاتی لای ئێمەدا دەستی پێ کرد. کە چێ ئەمڕۆ ڕۆژهەڵات بە جیهانێکی دواکەوتو و لە قەڵەم ئەدرێ.

خوسرەو جاف لێرەدا ئەڵێ.. یەکەمین ئاخ و ئۆف و ئای و زەبری زۆرداری. لەگەڵ شەتەکدانی هەردوو دەستی مرۆڤی بێ تاوان لە نێوان نەتەوەکەی ئێمەدا ڕویدا. هاوار ئەکا وەرن بایێشکەی مێژو بسوتێنین.
لە کوانوی حەقیقەتا گڕی گەورە هەڵگیرسێنین.
چەن دێڕێك لە بەشی دوهەمی شیعرەکەیدا:-
یەکەمین خۆشی و سەیران و بنیات نانی شارو دێ و شارستانی یەت لای ئێمەی شەرقی سەری هەڵدا.. وەك لە شیعرەکەیدا ئەڵێ (یەکەمین بەهار یەکەمین دێ یەکەمین شار). دواجار لە دێڕێکی تردا بە بۆچونی خۆم و واهەست ئەکەم شاعیر مەبەستی شارستانی یەتی بابلیەکان و ئاشوری یەکانە کە لە وڵاتی شەرقدا گەورەترین ڕژێمیان دروست کردوە. جوانترین شەریعەت و یاسایان بۆ جیهانی کۆمەلایەتی وەدەس هیناو. وەك لە شیعرەکەیدا ئەڵێ (یەکەمین یاساو تەرازو تاوان. یەکەمین بەزینی زوڵم و ململان).
لە کۆپلەیەکی تری ئەم هەڵبەستەدا ئەڵێ..

چوار مێخەی ئەبەدی یەت دەبچڕێنم
تەپڵێ سوپای هەر ئەوابون دەدڕێنم
دەدەم لە بازەنەی دەری لێنەدراو
گوێ هەڵدە خەم بۆ مارشی عەشقی نەبیراو
منی شەرقی

لێرەشدا خوسرەو جاف ئەڵێ.. هەرچەندێ چەرمە سەری و ئەشکەنجە بدرێم پەتی زۆردار دەبچڕێنم. بە گژی ئەو هێزەدا ئەچم کە ئەیەوێ بەرهەڵستی بکا لە شارستانی یەتیم و وجود ما. تەپڵی سوپای ئەو هێزە هەڵ دەدڕم کە داوای نەمانم ئەکا.
ماوەیەکە غەریقی.خەمی چیرۆك نووسین و خوێندنەوەی چیرۆکم. ناڵێم بە نووسینەوەی شیعر. هەر چەندێ شیعر شاعیرانی خۆمان و بێگانەکان ئەخوێنمەوە. لە شاعیرەکانی خۆمان سەییاب و بەیاتی و بلندو گۆران و نالی و حەسیب قەرداغی خوالێخۆشبوو بەشێکی زۆریش لە کۆمەڵە شیعرەکانی لەتیف هەلمەت لە وانەی بێگانەش... ئودونیس فەرەنسی و بوشکینی روسی و نازم حیکمەتی تورکی.
پارچە هەڵبەستێکی شاعیری یابانی (هاراسیکین)م[10] خوێندە و لە چەن دێڕێکدا ئەڵێ:-

گەردەلولی پاییز دەمرێ...
لێرەو لەوێ دەنگی خەڵك




بەشێنەیی..
بۆ ژیان دەگەڕێتەوە

بە بۆ چونی خۆم ئایدیۆلوجی یەتی خوسرەو جاف لە شیعر نوسیندا زۆر نزیکە لە ئایدۆلوجی یەتی ئەم شاعیرە یابانی یە. "لێرەدا شاعیری یابانی ڕۆژگاری ستەم و نالەبار وەك گەردەلولی پاییز پی شان ئەدا.

ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەبێ ئاسودەیی بگەڕێتەوە بۆ ژیانی ئەو خەڵکە ستەم دیدەیە. هەر وەك خوسرەو ئەڵێ:ـ

(وەرن بایێشکەی مێژو بسوتێنین.. لە کوانوی حەقیقەتا گڕی تێەردەین ئەو تەم و ناریکی یە نەمێنێ و ژیانێکی ئاسودەیی بگەڕێتەوە بۆ ئەو خەڵکەی کە لەم ڕۆژهەڵاتە ئەژین.

هەروەها لێرەدا ئەڵێ:ـ

(ئیتر حیلەی ئەسپی لە درۆ چاتکراوی مێژو نامترسێنێ)
شاعیر بە تەواوی ئیمانی نەماوە بە مێژو. ئەسپی خۆی تاو ئەدا بەرەو واقعیەت ڕۆژگارە سەختەکانی مێژو بە دروزن دائەنێ.. لە شوێنێکی تردا ئەڵێ..

منی ڕۆژ هەڵاتی کالکڵەی زەویم
چەشەی چاوگەی ئەزەلم من مانم
من ڕۆشنای مژم.. من کوڵەکەی ئاسمانم
دێ ی پێکەوە بێشکەی مێژو بسوتێنین
لە کوانوی حەقیقەتا گڕی گەورە هەڵگیرسێنین..؟

لە کوردەواری لای خۆماندا کاکڵە بە باشی و نایابی هەمو شتێك ئەوترێ وەك کاکڵە گوێز.. مێوژی نایاب.. بەڵام لێرەدا خوسرە هاوار ئەکا کە باشترین مرۆڤی ئەم سەرزەمینە ئێمەی ڕۆژهەڵاتین. یەکەم کۆمەڵی مرۆڤی شارستانی یەت و مێژوو ئێمەین. یەکەم روناکی مرۆڤایەتی لای ئێمەوە سەری هەڵدا.. کۆڵگەی ئاسمان ئێمەین.

ڕۆژگارو ئەزەل خیانەتی کرد لەگەڵ ئێمەی شەرقیدا. دەبا بسوتێنین بێشەکەی مێژوو.

شاعیر لە شوێنێکی تردا ئەڵێ:ـ

ولاتەکەم هەزاران سیزەفونی دیوە
هۆمیروس دەردی منی نەزانی وە
من چرای لەشم بەژان دەسوتێ
من خۆ لەمێشێکی ساردم گڕی ململانە
من دەریای ئارامم هاواری تۆفانە

کە لە پیاوانی مێژونوس ئەوانەی کە یەکەم جار مێژویان تۆمار کرد. هۆمیرۆسە.. هیرۆدۆتسەو کزنەفۆنە.. جا لێرەدا شاعیر باسی نەهاتی و نەداری و ڕۆژانی سەختی ژیانی نیشتمانەکەی ئەکاو. ئەڵێ هومیرۆسی مێژونوسی مەزن و بە ئاگا. نەیتوانیوە دەردی گەلەکەم تۆمار کا. گەلەکەم و دراوسێ یەکانم لە دێر زەمانەوە بە ئەشکەنجەو ئازار ئەتلانەوە بە ژانی بەردەوامیان ئەسوتان... لە گڕێکی بڵێسەدار بیون بە مەشخەڵی ئەو جیهانە. دوای زۆران بازی یەکی زۆر و ململانێ یەکی لەبن نەهات و بۆ مسوگەر کردنی ژیان وەك ژیلە مۆیەکی ساردوو کۆمەڵە خۆڵەمێشێکی بێ کەڵك ئەمانەوە. ئەمجارە هاوار ئەکا دەوەرە با بێشکەی مێژو بسوتێنین.

شاعیر بۆ دلسۆزی نەتەوەکەی سۆزێکی لەبن نەهات و گڕی ئەداو ئەڵێ:ـ

من خەڵکی وڵاتێکم مردووەکانی عاشقترین زیندوانن
سەرماو سۆڵەی دەردمان ئاگری کینە دەکوژێنێ تەوە لە پیاسەی
نەسیمی ماندوی شەوا
لە هوشیاری یا لە خەوا
دەنگی بلوێری سەرگەردانم لە پرسەی غەما
خانمی ڕەشپۆشی ڕوداو دێنێتە سەما
دەی ی یانا ئازادی...؟

نەوەك لەم کۆپلەیەدا بە تەنها بەڵکو لە سەرەتای هەڵبەستەکەی (رازی ئەزەل) شاعیر ڕەمزێکی زۆری بەکار هێناوە.

ڕەمزەکانی زۆرتر لە سروشتەوە وەرگرتووە.. لێرەدا شاعیر ئەڵێ من خەڵکی نیشتمانێکم مرۆڤەکەی ئەمەندەی توشی جەزرەمو سەختی ژیان هاتوون مردووەکانیشی زیندون بەدەم ئەشکەنجەو ئازارەوە ئەتلێنەوە. ئەو ئازارەی کە لە ناخانەوە ڕەگی کوتاوە. وەك تەوەفانە ئاگری کینە دەکوژێنێتەوە. سەرگەردانی و ماڵ کاولی بە دەنگێکی بەرز وەك بلوێر هاوار ئەکاو بەرێویە بەرەو پرسەی ماتەمی و ناخۆشی. ئەو خانمە ڕەشپۆشانەی کە ئەژنوی خۆیان لە ئامێزگرتووە بە بۆنەی ڕوداوە یەك لە دوای یەکەکانەوە. زۆر جار دێنە سەماو ڕەشبەڵەك. دوای ئەم هەمو کارەسات و ویشومە یەك لە دوای یەکانە.. ئازادی بۆ ڕوم تێناکەی و لە ئامێزت گرم.

لە دوا کۆپلەی هەڵبەستەکەیدا ئەڵێ ـ

هەزاران ساڵە ژینم دەدەن وەئاشە
هەر باشە
یەشتا جەنازەی غیرەتم بەسەر تەتەشۆری
ترسەوە نەشۆراوە
گڕی فرمێسکم کراوەتەوە
ئەمجا.. بەنی مۆمی ڕوحم نەکوژاوەتەوە
ئای شەرقی پەرومردەی ئێنشا ئەڵا

لێرەدا شاعیر دووبارە ئەیەوێ بەرەو ڕۆمانسیەت بگەڕێتەوە کە باسی هەڵ ڕشتنی فرمێسك ئەکا.. یەکسەر ئەڵێ یەنی مۆمی ڕوحم نەکوژاوەتەوە. مەمکی مەئیوسی هەڵنامژم ئەمجار ئەڵێ هەزاران ساڵە بەری ڕەنجم دەبرێ. لێرەدا بە بۆچونی من سەرەتایی ئەم کۆپلەیە نزیکە لە شیعرەکەی شاعیر کوردی بەناو بانگ (فائق بێکەس) کە ئەڵێ (بیست و حەوت ساڵە ڕەنج بەری تۆم بە جل و نان و بەرگی خۆم).

هەر لەم کۆپلەیەدا ئەیسەلمێنێ پیاوی ئازاو کۆڵنەدەر هیچ کاتێك ترسی و بێ غیرەتی لەدڵ و دەرونیدا ناتوانێ خۆی حەشاردا.

دوا جاریش هاوار ئەکا وەرن پێکەوە بێشکەی مێژو بسوتێنین لە کوانوی حەقیقەتا گڕی تێ بەردەین و هاوار بکەین ئازادی.. ئازادی... ئازادی.

## پەراوێز

١ ـ داڵکە = دایکی ئەکبەرو رەمزایە لە ڕۆمانی کوردەمەدا. روداوەکانی رۆمانی کوردەمەوە. لە گەرەکی تۆڵە فرۆشی خانەقین رویداوە
٢ ـ دستولیسکی ناقداً = آفاق عربية. عدد الاول ١٩٨٥ ص١٣٤ ـ ١٣٥
٣ ـ (هوميروس) = أول من دون التأريخ. يوناني الأصل
٤ ـ جوقور ئویا = ناوچەیەکە لە کوردوستانی خوارو. سەر بەتورکیا. ئەو شوێنەیە کە نووسەری مەزن (یەشار کەمال) چاوی تیا هەڵ هیناوە.
٥ ـ باوەشاسوار = ناوی خواپەرسێك و موسوڵمانێکی بەناوبانگە. لەسەر کێوێکی بەرز، بەرۆژهەڵاتی شاری (کفری)یەوە
٦ ـ کەلار = شارێکە سەر بە پارێزگای سولێمانی. نووسەر لەوێ لە دایك بووە
٧ ـ محمد سعید جاف = نووسەرێکی خامە رەنگین و خەمخواری وشەی کوردی بووە. باوکی نووسەرە خوسرەوجاف
٨ ـ حەمە پاشای جاف = باپیری نووسەرە سەرۆکی هەمووجاف بووە.
٩ ـ ئاب شۆران = ناوی رۆمانێکی فارسی یە.
١٠ ـ عەلی ئەشرەفیان = ناوی رۆمان نووسێکی فارسی یە.
١١ ـ هیچ. گەماڵ. راز ـ پاشایان کوشت ـ ناونیشانی رۆمانەکانی خوسرەوە
١٢ ـ هایدە = ناونیشانی چیرۆکێکی خوسرەوە لە بەیان ژمارە ١٦٦/ ١٩٩٠ ص٥٦ـ٥٧
١٣ ـ مەنیژەگیان = پارچە پەخشانێکی نووسەرە لە بەیان ژمارە ١٤٧/ ١٩٨٨
١٤ ـ عازف المزمار = ناونیشانی پەخشانێکی نووسەرە لە ألیف باء دەرچووە عدد ـ ١٤٩٧/ حزيران/ ١٩٩٧ ص٣٤ـ٣٥
١٥ ـ هارسین = شیعرێکی یابانی یە جفری بوتای نووسیویە کاظم سعدالدين کردویە بەعەرەبی. لەتیف هەڵمەت کردویە بەکوردی بەیان ژمارە (٧٤)

## سەرچاوەکان


١ ـ بەیان ژمارە ١٦٦ ساڵی ١٩٩٠. ناونیشانی چیرۆك (هایدە) ل٥٦ ـ ٦١ نووسەر خوسرەوجاف
٢ ـ عازف المزمار. ألیف باء العدد ١٤٩٧ ٤/حزيران ١٩٩٧ نووسەر خوسرەو ص٣٤ ـ ٣٥
٣ ـ نوسەری کورد ژمارە (١٠) ساڵی ١٩٩٧ ناونیشان (نەورۆزو) من و ئازیز) ص١٩ـ٢٠ نووسەر خوسرەو
٤ ـ بەیان ژمارە ١٤٧ ساڵی ١٩٨٨ ص٥٢ ـ ٥٣ پەخشان ناونیشان (مەنیژە گیان) نووسەر خوسرەو
٥ ـ بەیان ژمارە (٧٤) ساڵی ١٩٨٠ ص٦٢
٦ ـ دستوفیسکی ناقداً ـ آفاق عربية العدد الاول كانون الثاني سنة ١٩٨٥ ص١٣٤ ـ ١٣٥. الكاتب عباس خلف.
٧ ـ رەنگین ژمارە ١٠٨ کانونی دووهەم ١٩٩٨ ص٢٦ ـ ٢٧. ناونیشان (رازی ئەزەل) نووسەر خوسرەو.
٨ ـ أعلام الشعر العربي الحديث. بدر شاكر السياب. المؤلف ريتا عوض.


## ملخص البحث

## «خسرو ـ جاف وعالم الادب»

### «سالار اسماعيل سمين» کۆچانی


في هذا البحث دراسة طويلة حول حياة الاديب خسرو جاف وأمكانياته الادبية في عالم الأدب. ونرى كيف رخى لجام حصانه الأدبي وشده على مركبه منذ السبعينات. ودخل في منحدرات هذه المهنة الصعبة. ويعرض الى النقد في بداياته. وخاصة بعد إصدار روايته المعنونة (الوادي) ولكنه أثبت وجوده بعد إنتاجاته الوفيرة من المطبوعات الادبية. وخاصة منذ بداية التسعينات حيث أصدر مجموعة من الروايات الادبية. مثل الوادي ولاشيء والكلب وقتلو باشا وراز وكتاب بعنوان (دائرة المعارف). ومجموعات كثيرة من القصائد وقصص قصيرة ومقطوعات غير قليلة من النثر. الأديب خسرو تفنن في جميع أنواع الأدب. سواء كان في الرواية أو القصة القصيرة أو الشعر أو النثر. وكتاباته في المجلات والجرائد تشهد على ذلك. في هذه الدراسة قمتُ بنقد وشرح مقطوعة نثره بعنوان (مەنیجەگیان) وفي هذه المقطوعة شبه شفتا حبيبته الورديّة بمكان جرح سكين حاد في مكان من الجسم. وكيف ينفتح الجرح مثل شفتا حبيبته وينادي بالوصال والتقبيل. وفي قصيدته (رازی ئەزەل) أظهر الشاعر نفسه في صراع مع صعوبات الحياة. وبين عدم رضائه من رواد مسجلي التأريخ. حيث يقول لم يسجل هوميروس آهات وعذابات أهل الشرق. وخاتنا لذا يجب أن أحرق مهد التأريخ وأضرم ناراً ولهيباً في منقلة الحقيقة... الأديب من مواليد قضاء (كلار) محافظة السليمانية. وهو من أحفاد عائلة متنفذة من رؤساء عشيرة الجاف. وعمره في ربيعه الخمسين وحالياً مهندس معماري ذو شهرة ويعيش في بغداد.



# عثمان صبري سەركێشێ هۆزانا سەربەست

شەبان مزيري

عثمان صبري. . هوزانڤان وتورەڤان ل سالا (١٩٠٥) ل گوندێ (نارنجى)[1] ژدايك بۆيە. . ئەوا دكەڤيتە دناڤ جهێ عێلا (مرديسێ) ل دەڤەرا مێردين. . ل وەلاتێ توزكيا. . ژێ وى (٨) هەشت سال بۆ دەمێ بابێ وى چويە بەردلوڤانى يا خودێ. . ئو ل سەر دەستێ مامێ خو هاتە مەزن كرن. . عمر دزەيى[2] دبێژيتن ل سالا (١٩٠٦) ل بازێرێ «ملاطيە» ژدايك بۆيە. . هەتا پولا (٦) شەشێ يادەست پێكێ ل خاندنگەهێت حكومەتێ خاندى يە. . پشتى هينگى چوو قەستا خاندنگەهێت ئولێ كرى يە. . ل سالا ١٩٢٩ ژتوركيا مشەخت بۆيە. . ئو قەستا شامێ كر. . ل خاندنگەها (عەنديومر) بويە سەيدا ل وەلاتێ شامێ پێنياسين دگەل رێبەرێ كوردێ نەمر مير جەلادت بەدرخان كر. . ئو هۆزان و پەخشان بۆ كوڤارا هاوارێ نڤيسينە.

باوەرە بەلاڤبونا «هاوارێ» سالا ١٩٣٢ ئو ئاڤاكرنا دبستانا روشنبيرى يا نۆێ كوڤارێ ژلايێ رێبەرێ نەمر مير «جەلادەت» «بەدرخان»ى ئو برايێ وى مير «كامران» «بەدرخان»ى يەك ژ سێ گرنگترين بويەرين روشەنبيرى بو، پشتى دەركەتنا «مەم وزين»ى ئو «كوردستان»ێ يەكەم رۆژنامەيێ ئەڤێ دبستانێ كو چەند رۆژنامە ئو كوڤارێن دن وەك «روناهى»، رۆژانو، ئو «ستێر»ێ بەلاڤكرن ل گەل چەندين كتێبان لە سەر رێزمان رێنڤيس، ديروك جڤاك ئو گەلەك مژادێن دن. ڤێ دبستانێ زمانێ تورى، ئانكو ئەدەبى يێ، سەرەكى يێ كوردى، دامەزراند ئو نهو ل بەهرا پترا كوردستانێ ب كاردهێت.
ب دانانا ئەلفابێ يا تايبەتى يا كوردى ميرێ نەمر جەلادەت «بەدرخان»ى بنياتەك قايم بۆ نڤيسينا ئەدەبى يا كوردى دانا چونكو ئەلفابێ يا كێرهاتى مەرجەك سەرەكى يە بۆ ڤێ نڤيسينێ، وەكو دە هەر كەس دێ ب كەيفا خو نڤيست. . ئو زمان يان «نڤيسينا ئەدەبى يا پێڤانى درست نابت.

هەلبەت «هاوار» ب كرمانجى دەردكەت كو زاراڤێ سەرەكى يێ كوردى يە، لێ ئەڤ كرمانجى يە نە بوتانى بۆ لێ. . بەلكو پێڤانى بو. مير «جەلادەت»ى بزاڤ دكر كو زمانێ كوڤارا «هاوار»ێ قالبێ دەڤەرەك كوردستانێ ى تەنێ نەگرت. بۆ نمونە وى (بى)، دەربرينا بۆنێ، ياهندەك كرمانجان هەر دكر (بو)، كو سوران ئو گەلەك كوردێن دن ب كاردهينن.

ل دور دبستانا «هاوارێ» ل«شام»ێ گەلەك روشەنبيرێن مەزن كوم بيون، ژبلى مير جەلادەت بەدرخان، د. كامران بەدرخان ئو (روشەن بەردرخان»ێ: جەگەرخوين، ئوسمان سەبرى، قەدرى جان، عەلى سەيدو گەورانى، د. ئەحمەد نافز، قەدرى جەميل پاشا. د. نورالدين زازا. چەند روشەنبيرێن ناڤدار ژى ژ كوردستانا باشور بۆ كوڤارا (هاو ‌ ‌)ێ دنڤيسين وەك: فائق بێكەس، عبدالخالق ئەسيرى، حامد فەرەج، ساكر فتاح، گوران، ئو گەلەك دى.

ل ڤێرێ پێدڤيت مروڤ بێژت، بۆ بهاكرنا هەيەرى يا كارێ ڤان روشەنبيران كو پشتى تەپەسەركرنا بزاڤا كوردايەتى يێ ل كوردستانا باكور، (ئو باشورو رۆژهەلاتێ ژى)، پاشى ئەورەك تارى دوان رۆژێن رەشدا هەمى كوردستان كۆ وى دەمى هەر خەباتا دەستەكا روشەنبيرێن كوردپەروەرێن كو ل دور خويبونێ كوم بيون، ئەو تارى پچەكێ روهن دكر ئو هيڤى يا ملەتى گەش دكر.

دكتور بەدرخان سندي ل دور عثمان صبري نڤيسى يە. . «عثمان صەبري هوزانڤانەكێ بناڤ و دەنگە ل سوريێ ژيايە. . هوزانێت وى

وهندەك گوتارێت جڤاكی نە.

٢- رامان: پەرتوكەكە ل دور رەوشەنبیری یا گشتی نفیسی یە.

٣- ئەلف بێ یا كوردی ل سالا ١٩٥٥ ل شامێ ل چاپخانا كرم چاپ بویە.

٤- باهوز وچەند نڤیسارێن دن.. دیوانەكا هوزانایە ل شامێ ل چاپخانا (كرم) ل سالا ١٩٥٦ هاتی یەچاپكرن.

٥- زنجیرەیەك گوتاران ل بن نافنیشانا تاریخا كوردان هاوار هەژمار ٢٨ - ٣٠.

٦- دو خوەندن یەك دیروكی ل سەر ئاگری (هاوار): هەژمار ٣٦ ئویەك جڤاكی:

مردێسان ئو گاوەستی یێن وان هەژماره ٥٢

گاوەستی پاشمایی یا ئێلێ یە

## دەهمەن وژێدەر:-


١- عبدالرحمن مزوری - كوڤارا كاروان هژمارا (٤٢).

٢- عمر دزەیی - كوڤارا كاروان هژمارا (٣٧) ل٨١.

٣- دكتور بدرخان سندي كوڤارا رەوشەنبیری نوێ هژمارا (١٢٨)یا سالا ١٩٩٢.

كاغەزا هێژا سەلاح سعداللە بو من هنارتی ل روژا ٢٠/١٢/١٩٩٧.

٤- توما بوا - لمحة عن الاكراد - وەرگێرانا محمد شریف عثمان چاپخانا النعمان - النجف الاشرف سالا ١٩٧٣.

٥- توما بوا - مع الاكراد وەرگێرانا ئاواز زەنگەنە چاپخانا دار الجاحظ بغداد سالا ١٩٧٥.

٦- دكتور بدرخان سندي ژێدەرێ بەراهیكێ.

٧- دكتور بدرخان سندي ژێدەرێ بەراهیكێ.

٨- عمر دزەیی ژێدەرێ بەراهیكێ.

٩- عمر دزەیی ژێدەرێ بەراهیكێ.

١٠- حسن كوو‌خی روژناما بزاڤ هژمارا (١٥) یاروژا ٧/١١/١٩٨٩.

١١- مصطفی نەریمان بیبیوگرافیای دوو صەد سالی كتێبی كوردی ١٧٨٧ - ١٩٨٦ چاپخانەی الزمان بەغدا سالا ١٩٨٩.

١٢- ئەو پارچێت هوزانێ باراپتر ژ گوتارا عبدالرحمن مزوری هاتی نە وەرگرتن ئەوا دكوڤارا كاروان دا هژمارا (٤٢) هاتی یە بەلافەكرن.

١٣- دكتور بدرخان سندی كوڤارا (بەیان) هژمارا (١٧١) سالا ١٩٩٣.


## ملخص البحث

# عثمان صبري رائد الشعر الحر الكردي


شعبان مزيري


ولد الشاعر عثمان صبري عام (١٩٠٥) في قرية (نارنجی) التي تضم عشيرة (مرديس) في منطقة (ماردين) في كردستان تركيا.

الا ان الاديب عمر دزيي يقول انه ولد عام ١٩٠٦ في مدينة ملاطية. وعندما كان عمره (٨) سنوات توفي والده وتربى في كنف عمه.

كتب الشعر ومارس كتابة المقالة ونشر بعض قصائده في مجلة (هاوار - الصرخة - ١٩٣٢ - ١٩٣٥) التي كان يصدرها في الشام الامير جلادت بدرخان وكذلك نشر قصائده في جريدة (روژانو - يوم جديد) التي كانت يصدرها الدكتور كامران بدرخان في بيروت بين الاعوام (١٩٤٣ - ١٩٤٦) وفي السنة الاولى من صدور مجلة (هاوار - صرخة).. نشر قصيدة واحدة فقط لتهنئة مجلة (هاوار) بمناسبة صدورها.. وكذلك اراد ان يوضح لصديقه قدري جان بعض الهموم والالام وخلجات نفسه الوطنية.

تأثر عثمان صبري بكل من كامران بدرخان وقدري جان اللذين احدثا ثورة في شكل ومضمون القصيدة الكلاسيكية وكتب قصائد على وزن الغناء الكردي (حەیرانوك) واستخدم الوزن (نەنگ - الصوت) الموجود في الاغنية الكردية الفلكلورية وهذا ما نلاحظه في ديوانه المطبوع - (باهوز - العاصفة) حيث ان معظم القصائد المنشورة ضمن دفتي الديوان استخدم فيه الوزن الكردي الفلكلوري كما يقول:

واهات

قایە هات با..

جیهان تەڤ بوسەرما.. الخ

اضافة الى كتابه الشعر فقد كتب عثمان صبري قصصاً قصيرة ومقالات تاريخية واجتماعية وسياسية ولغوية وقد جمعها ونشرها على شكل كتاب تحت عنوان «دەردێن مە - الامنا» وكتاب ثان هو (رامان - الفكر).

وتوفي الشاعر في عام ١٩٩٣.

الباحث يحاول ان يبين في بحثه هذا بان ريادة الشعر للشاعر قدري جان وقد كتب قصيدة في الشعر الحر في ١٥/٥/١٩٣٢ اي قبل ثلاثة ايام من كتابة قصيدة (بەردێلك) التي ارخها الشاعر عثمان صبري في ١٨/٥/١٩٣٢.

وقد نشر قدري جان تلك القصيدة مع خاطرة جيلة في العدد الاول من مجلة (هاوار: واهداها الى صديقه عثمان صبري يبشره بصدور مجلة (هاوار).

اما قصيدة عثمان صبري (بەردێلك) والتي اهداها الى قدري جان رداً على قصيدته التي اهداها له ايضاً فانه قد نشرها في العدد الثاني من مجلة هاوار عام ١٩٣٢.

# سەرواو جۆرەکانی لە شیعری کوردیدا

بەشی یەکەم

عەزیز عەبدوڵلا ئەحمەد

- پێشەکی
- چی لە بارەی سەروای کوردییەوە نووسراوە؟
- زاراوەو چەمکی سەروا.

بەشی یەکەم: دابەش کردنی سەروا لە ڕوانگەی ئاسۆییەوە:

١ - بە پێی پێکهاتنی وشەی سەروا.
٢ - بە پێی ژمارەی سەروا لە ئاستی ئاسۆییدا.
٣ - بە پێی شوێنی وشەی سەروا لە دێرە شیعردا.
٤ - بە پێی دوا دەنگی سەروا.
٥- بە پێی مەودای دەنگەکانی سەروا.
٦- بە پێی جۆری دەنگەکانی سەروا.
٧- بە پێی دەنگەکانی پێش ڕەوی.
٨- بە پێی کێشی زەرب.
٩- بە پێی چالاکی ڕەوی.

**بەشی دووەم:** دابەش کردنی سەروا لە ڕوانگەی ستوونیەوە:

١- بە پێی لایەنی وشەیی لە ئاراستەی ستوونی سەروادا.
٢- بە پێی سیستەمی دووبارە بوونەوەی سەروا.

ئەنجام.
بیبلۆگرافیا.

## پێشەکی

بابەتی لێکۆڵینەوەکە: ئەم لێکۆڵینەوەیە بریتییە لە شی کردنەوەو پۆلێن کردنی سەروای شیعری کوردی و دەرخستنی جۆرە جیاوازەکانی لە ڕوانگەی لە هەردوو تەوەرەوە: ئاسۆیی و ستوونی. ئەمەیش وەك دیارە لە لێکۆڵینەوەی وەسفی ـ شیکاری شیعری کوردییەوە دەست کەوتووە، هەر لە باباتاهیری هەمەدانییەوە (٩٣٠ ـ ١٠١٠) تا سەردەمی نوێ. لێکۆڵینەوەکە غەزەل و قەسیدەو تەرجیع بەندو تەرکیب بەندو مسەممەت و پێنج خشتەکی و چوارینەو سێینەو شیعری مەسنەوی و تاك ڕەگەزی گرتۆتەوە.

هۆی هەڵبژاردنی ئەم بابەتە: هۆی هەڵبژاردنی ئەم بابەتە بۆ لێکۆڵینەوە، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە شیعری کوردی زۆر پابەندی سەروایەو لەم ڕووەوە سامانێکی زۆرمان لە بەردەستدایە کە وەکو کەرەستە وایە پێویستی بە لێکۆڵینەوەیە بۆ ئەوەی جۆرەکانی سەرو پێشان بدرێ و دەوری لە ئاوازو مۆسیقای شیعر ڕون بکرێتەوە. ئەنجامدانی ئەم جۆرە کارە دیراساتی شیعری قووڵتر دەکاتەوەو هەوڵێکە بۆ پڕکردنەوەی کەلێنێکی تر لە لێکۆڵینەوەی شیعری کوردی چونکە تا ئێستا لێکۆڵینەوەیەکی فراوان بۆ سەروای شیعری کوردی نەکراوە ئەوەی هەیە سەرنج و بابەتی کورت و پچڕپچڕە کە لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا یان لە چەند دێرو ئەو پەرەکەی چەند لاپەڕەیەکی هەندێ کتێبدا هاتووە. بۆیە ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەیەکی مەیلە و فراوانی بابەتەکە یەکێکە لە پێویستییەکانی لێکۆڵینەوەی شیعری کوردی.

**پرۆگرامی لێکۆڵینەوەکە:** لێکۆڵینەوەکە جگە لەم پێشەکییەو پێداچوونەوەیەکی خێرای ئەو کارانەی لە بواری سەرواناسی کوردیدا کراون و ڕون کردنەوەی زاراوەو چەمکی سەروا، لە دووبەش پێك هاتوە کە پوختەی ئەنجامی کارەکەو ناوی سەرچاوەکانیان (بیبلیۆگرافیا) بە دوادا هاتوە بەشی یەکەم: دابەش کردنی سەروایە لە ڕوانگەی ئاسۆییەوە بەڵام بە پێی بۆ چوون و گۆشەنیگای جیاجیاوە وەکو: پێکهاتنی وشەی سەرواو ژمارەو شوێنی سەروا لە دێرە شیعردا، ئینجا بە پێی دوادەنگی دێرە شیعرو مەوداو جۆرەکانی دەنگەکانی سەرواو بە گوێرەی دەنگی پێش ڕەوی و چالاکی ڕەوی خۆیەوە، جگە لە دابەش کردنی سەروا بە گوێرەی زەربی دێرە شیعر کە بینای قەسیدەی لەسەر دەکرێ. بەشی دووەم: بە پێی لایەنی وشەیی و سیستەمی دووبارەبوونەوەی سەروا لە ڕوانگەی ستوونییەوە جۆرەکانی سەروا لێك جیادەکاتەوە.

ئەنجامیش ئەو خاڵانەی تێدا پوختە کراوەتەوە کە لە لێکۆڵینەوەکەدا پێی گەیشتووین.

**تێبینی:** (١) بۆ هەموو جۆرە سەروایەك بە پێویستمان نەزانیوە نموونەی شیعری کوردی بێنینەوە تەنیا لە شوێنی پێویست نموونەمان داوەو بەس، ئەوەی تر ئەگەر پێویست بووبێ ئیشارەتمان بۆ سەرچاوەکە کردوەوبەس.

(٢) لە ئاماژەکردن بۆ سەرچاوە، سیستەمی (داکردن ـ خزن ـ کۆد) مان بەکارهێناو. لە بیبلۆگرافیادا ژمارەمان بۆ سەرچاوەکان داناوەو لە هەرکوێ شتێ سەرچاوەیەك وەرگیرابێ یان پێویست بە ئاماژە بووبێ تەنیا ژمارەی لاپەڕەکەمان نوسیوە. بۆ نموونە ئەگەر بەم جۆرە ئاماژە بۆ پەراوێزێك کرابوو [٧، ل٢٢] مانای وایە ئاماژەکە بۆ لاپەڕەی (٣٢)ی سەرچاوەی ژمارە حەوتە.

## چی لەبارەی سەروای کوردییەوە نووسراوە؟

لە کوردیدا زۆر کەم شت لە بارەی سەرواوە نووسراوە. بەپێی ئاگاداری ئێمە کۆنترین شت لە بارەی سەرواوە نووسرابێ ئەو چەند دێرەیە کە ساڵی ١٩٢٠ ئەمین فەیزی لە (ئەنجوومەنی ئەدیبان) دا، لە بارەی شیعرێکی مەولەوی نووسیویەو دەڵێ: (مەولەوی بە موقتەزای ئەو مەوقیعە کە تێدابوە، هیچ چاوی بە شیعری فەرەنگ نەکەوتوە، لەگەڵ ئەوەش لەسەر ئوسلووبی ئەوان شیعری نەزم کردوە، لەقیتعەیێکدا مەسرەعی ئەووەلی تەقفیە کردوە لەگەڵ مەسرەعی سالیس و قافیەی مەسرەعی سانی ڕێك خستوە لەگەڵ مەسرەعی رابیع . . . . . ئەم ئوسووڵە خیلافی ئوسووڵی شوعەرای ئێرانەو مەولەوی لەکەسی

ئەدیوە. مەحزەن بەحوسنی تەبیعەتی خۆی موناسیبی زانیوەو ئیستعمالی کردوە) [٤، ل٣١]. ئەمین فەیزی ئەمەی لە بارەی چەند دێرێکی مەولەوی گوتوە کە لە باتی سەرروای مەسنەوی (کە هەموو شیعرەکانی مەسنەوییە)، ئەو چەند دێرەی بە سەرروای موتەناویب دارشتوە (A B A B)، بەلای منەوە هۆی ئەم کارەی مەولەوی بو ئەوە دەگەڕێتەوە کە ویستویەتی شێوانی حاڵی خۆی بە شێواندنی سەرروا باشتر پیشان بدا، واتە ئەمە لای مەولەوی جۆرە شێواندنێکە لە سەرروا ڕەنگدانەوەی شێوانی حاڵ و دەردی گران و ناڵەباری باری دەروونیەتی، چونکە خۆی پێش ئەم گۆڕینی قالبی سەرروایە، دەڵێ:

**مەنعم مەکەردی گرانەن دەردم**
**ئەر شێویا بۆ قافیەی فەردم [٢٤، ل٦٩]**

شێخ نووری شێخ سالح، ساڵی ١٩٢٦، لە ڕۆژنامەی (ژیان)دا چەند دێرێکی لە ژێر ناوی (قافیە) لە بارەی سەررواوە بڵاوکردۆتەوە، دەڵێ: (قافیە ـ لەنیهایەتی هەر مەسرەعێکدا لە بەینی هیجای ئاخریدا بە ئیعتیاری تەسەووت عیبارەتەکە لە موتابەقەت. . . . مەقسەد لە قافیە بۆ ئیفادەی تەئمینی ئاهەنگێکی مۆسیقیە. . . . لە نیهایەتی مەسرەعەکاندا هیجاکانی ئاخیری ئەگەر مالیکی عەینی تەرزی تەسەووت بوون ئەو تەنازورەی کە لە بەینی ئەسواتا حاسیل ئەبێ سامیعە نەواز ئەبێ) [٢٧]. لەم پێناسەو ڕوون کردنەوەیەی شێخ نووری دوو خاڵی گرنگ سەرنج ڕادەکێشێ: یەکەم: حیسابی هیجا (برگە) بۆ سەرواکراوە نەك تیپ (حرف). دووەم: ئەرکی سەرروا پێشان دراوە کە دەستەبەر کردنی ئاوازێکی مۆسیقیە بۆ شیعر.

جەمال عیرفان، ساڵی ١٩٤٢، (٢٧) پەندو فەلسەفەی گشتی کورتی لە ژمارە (٧، ٨)ی گۆڤاری (گەلاوێژ) بڵاوکردۆتەوە، لە ژمارەی (٢٦)دا باسی سەرروا دەکات و دەڵێ: (شیعر موتلەقەن قافیەی پێویست بوایە، ئەبوایە هەر بەقەدەر قافیەی ئەشعار بێژرایە) [٩، ل٨٠]. جەمال عیرفان پەیوەندی نێوان ڕەوی و ئەندازەی شیعر پێشان دەدا.

ئیحسان ساڵی ١٩٥٨ لە ڕۆژنامەی (ژین) لە وتارێکدا بە ناوی (بەراوردێکی ئەدەبی کوردی)، باسی حاجی قادر دەکات ودەڵێ: (بەڵام هەر لەم سەدەیەدا، حاجی قادر لە قافیەی یەك شێوە هەتا ڕادەیەك خۆی ڕزگار کرد) [٦]. ڕاستی، شیعرەکانی حاجی لە ڕووی سەررواوە دوو جۆرن: جۆرێکیان کە غەزەل و قەسیدەیە یەکێتی سەرروایان تێدا پەیڕەو کراوە، جۆرەکەی تریشیان هەمووی مەسنەوییە.

ڕەفیق حیلمی لە هەردوو یەکی (شیعرو ئەدەبیاتی کوردی)دا، لە زۆر شوێندا کە شیعری شاعیرەکان هەڵدەسەنگێنێ و ڕەخنەیان لێ دەگرێ، قسە لە سەرروایش دەکات و کەم و کورتی شیعرەکان لە ڕووی سەررواوە دەردەخا. وەك سەرنجێکی گشتی لە بارەی شیعرە کلاسیکییەکان و بەکارهێنانی یەکێتی سەررواوە دەڵێ: (ئاسۆی تەفکیری شاعیرەکان زۆر سنووردارو ماوەی قافیە بازییان ئێجگار تەنگ بوە، و بە هۆی ئەم قافیە تەنگی وسنووردارییەوە ماوەی شیعریان کورت بوەو هەندێ جار لە پێنج بەیت تێپەڕی نەکردوە) [١٤، ١٢٧]. لێرەدا ڕفیق حیلمی دەوری قافیە تەنگی پیشان دەدا لە هەناسە کورتی شاعیرانی کلاسیك و کورتی قەسیدە بۆ کورتی سەرروا دەباتەوە. هەر لەو کتێبەدا، لە باسی شیعرەکانی حەمدی و دڵدارو ڕەمزی مەلامارف و سەلام دا، سەرروایش دەخاتە ناو چوارچێوەی لێکۆڵینەوەکەی کەم و کورتی هەندێ لە شیعرەکانیان بە بارەی سەرروا دەردەخا. بۆ نموونە لە باسی وەرگێڕانی خەیامی سەلام دا ڕەخنە لە دووبارەکردنەوەی وشەی سەرروا دەگرێ دەڵێ: (وشەی ـ ئاو ـ دووجارکراوە بە قافیە کە ئەمە ڕەخنەی لێ ئەگیرێ) [١٤، ل٩٢]، کە چی کە دێتە سەر گۆران و شیعرەکانی، زۆری پێ هەڵدەڵێ بە تایبەتی لە دەسەڵات شکانی بەسەر سەرروا هێنانەوە دا، دەڵێ: (لە کاتێکا کە زۆرکەس مل کەچی قافیە ئەبن، گۆران قافیەی مل کەچی خۆی کردوە. بۆ قافیەیەکی تایبەتی ڕەوانی و سەلامەتی بیری خۆی نە ئاڵۆزانەوەو تێك نەداوەو ڕشتەی خەیاڵی قافیە وەکو مێوو ڕوونە بە دەستیەوە، بەمەیلی خۆی یاری پێ ئەکا. . . . زۆر جاریش ڕەنگە هەر بیری لە قافیە نەکردبێتەوە، لەگەڵ ئەمەشا شیعرەکانی سەراپا قافیەدارە؛ چونکە چەشکەیێکی بەرزی تەبیعی وشەکانی لە وێنەی ـ سەجع وقافیە ـ دا هانیوە بەسەر زمانیا) [١٤، ١٧٤]. ئەم شایەتییە ئەو پەڕی توانای گۆران پێشان دەدا لە هێنانی سەرواو بەکار هێنانی وەکو ڕەگەزێکی بنچینەیی و سروشتی پتەوکردنی دارشتن و بەرزکردنەوەی کاریگەری شیعر.

یەکەم هەوڵی نەختێ فراوان بۆ باس کردنی سەرواو جۆرەکانی، کارەکەی (دکتۆر) مارووف خەزنەدارە لە کتێبی (کێش و قافیە لە شیعری کوردی دا) کە نۆ لاپەڕەی (٥٦ ـ ٦٤) بۆ لێکۆڵینەوەی (قافیەی شیعری کوردی) تەرخان کردوە [٢٣]. پێناسەی سەرروا دەکات و دابەشی دوو جۆری دەکات: یەکێتی سەرواو سەرروای ڕەنگاوڕەنگ. لە باسی یەکێتی سەرروادا، هەوڵێکی ناڕاستەو خۆ هەیە بۆ دیارکردنی سنووری سەرروا. ئینجا یەکەم جار لە کوردیدا باسی (پاش قافیە) دەکات و دابەشی دەکات بۆ یەك وشەیی ڕستەو ـ شوبەرستە ـ، لە کۆتاییدا باسێکی جووت سەرواو سەرروای خۆماڵی و سەرروای لاوك و حەیران و دەقی ئاییی یەزیدییەکان دەکات.

عەلائەدین سجادی ساڵی ١٩٦٧ کتێبی (ئەدەبی کوردی و لێ کۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی) بڵاوکردەوە. پێناسەی سەرروا دەکات و لە جیاکردنەوەی هۆنراوەو پەخشاندا سەرروا بە نیشانەیەکی هۆنراوە دادەنێ [١٨، ل١٣٤]. لە هەڵسەنگاندنی شیعرێکی شێخ نووری دا کە یەکێتی سەرروای تێدا پەیڕەونەکراوە، هەوڵ دەدا وردەکاری شێخ نووری لەم ڕووەوە ڕوون بکاتەوەو لە کۆتاییدا دەڵێ: (مەگەر تۆفیق فیکرەت ئەم ڕچەیەی شکاندبێ) [١٨، ل٣١٨]، ئەمە چمکێکی کاریگەی تۆفیق فیکرەت پێشان دەدا لە ڕەوتی تازە کردنەوەی شیعری کوردی لای شێخ نووری. بۆ ساڵی ١٩٧٠، سجادی کتێبی (نرخ شناسی) بڵاوکردەوە، لەوێش لەچەند جێگایەك باسی سەرروا دەکات و سەرروا بە (دیمەنێکی ڕواڵەتی تەواو یەکێ لە پایە هەرە گرنگەکانی هۆنراوە دادەنێ) [١٩، ل١٠٣]، ئینجا باسی سەرروا دەکات لە دووتاکی و قەسیدەو غەزەل و ئەوەیش دەڵێ کە سەرروا لە یۆنانی کۆن و ئەوێستا نەبوە بەڵام لەڕاستیدا ئەوانیش جۆرێ لە سەرروایان دووبارەکردنەوەی چەپکە دەنگیان

هەبوە، بەڵام بەشێوەی ناسراوی سەرواى ئێستانا.

ئازاد عەبدولواحید، وتارێکی لە بارەی سەرواى دیوان (پوچی ئەو کچە...)ی لەتیف هەڵمەت لە گۆڤاری (بەیان) بڵاوکردەوە [١، ل١٤ - ١٩]. وتارەکەی هەندێ سەرنجی وردو چاکی تێدایە بەڵام زۆرجار لە باسەکە لای داوەو چۆتە سەرکێش و ڕەوانبێژی بێ ئەوەی ئەم لادانە هیچ پەیوەندی بە سەرواوە هەبێ، زۆرجاریش سۆزی هەڵچووی هەڵەی نائزانستی پێ بردۆتە سەر لەتیف هەڵمەت.

کەریم شارەزا، ساڵی ١٩٨٤، لە بەرگی (١١) یازدەمینی (گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق - دەستەی کورد)دا، لێکۆڵینەوەیەکی بە ناوی (ساغ کردنەوەی هەندێ گیروگرفتی شیعرەکانی حاجی قادری کۆیی) بڵاوکردۆتەوە [٢١، ل٢٤٦ - ٢٦١]. هەوڵی داوە هەندێ لەکەم و کورتییەکانی سەرواى شیعری حاجی بەهۆی سەرواناسییەوە ڕاست بکاتەوە. نۆزدە (١٩) تێبینی وردی نووسیوە کە لاوازی و کەم و کورتی شیعرەکان دەردەخات.

محەمەد سەعیدی ئیبراهیمی محەممەدی، کتێبێکی بە ناوی (گەشتێ لە عیلمی بەلاغە)دا بڵاوکردۆتەوە، لە پاڵ ڕەوانبێژیدا باسی سەرواشی کردوە. پاش پێناسەکردنی سەرواو ڕوونکردنەوەی ماناى ڕەدیف وڕەوی هەندێ زاراوەی تری سەر بە سەرواناسی، دابەش بوونی سەرواى دەست نیشان کردوە فەردو چوارینەو پێنج خشتەکی و غەزەل و قەسیدەو مەسنەوی و تەرکیب بەندو موستەزاد [٢٥، ل١٠٩ - ١٣٣].

لە کۆتایی هەشتاکان و لە نەوەدەکان، کۆمەڵێ نامەی ئەکادیمی بۆ وەرگرتنی بڕوانامەی ماجستێر و دکتۆرا لە ئەدەبیاتی کوردیدا پێشکەشی زانکۆی هەڵەدران و زانکۆی سەلاحەدین کران. هەندێکیان چەند لاپەڕەیەکیان بۆ باسی سەروا تەرخان کردوە بەڵام زۆربەیان هەر بۆ تەواوکردنی بابەتی لێکۆڵینەوەکەیان سەروایان تێ خستوە، بۆیە بەلێکدانەوەی چەند زاراوەیەکی سەرواى عەرەبی و پەیڕەوکردنی بەسەر شیعری کوردیدا وازیان هێناوە لەوانە تەنیا دلشاد عەلی لە هەردوو نامەی ماجستێر و دکتۆرا، نەختێ بە فراوانی چۆتە ناوباسی سەروا. لە نامەی ماجستێرەکەیدا (بنیاتی هەڵبەست لە هۆنراوەی کوردی دا)، [١٢، ل١٠٠ - ١٢٦] ڕۆڵی سەرواى پیشان داوە لە بنیاتی هونەرەکانی شیعری کوردی وەکو غەزەل و جووت سەرواو موەششەح و موسەممەت. لە نامەی دکتۆرایشیدا (دیلانی مرۆڤ و شاعیر) [١٣، ل٢٧٧ - ٢٩٩]، لە گۆشەنیگای یەکێتی سەرواو سەرواى ڕەنگاو ڕەنگەوە لە شیعرەکانی دیلانی کۆڵیوەتەوە.

کەمال مستەفا مەعروف لە ساڵی ١٩٩٢ کتێبی (الحركة التجديدية في الشعر الكردي الحديث ١٩١٤ - ١٩٦٥)ی لە ستۆکهۆڵم بڵاوکردەوە [٣٥، ل٢٦٢ - ٢٦٧] پێناسەی سەرواى کردوەو لە ڕەوی و ڕەدیف دواوە، بەڵام لە نموونەی ڕەدیف و تەئسیس نەپێکاوەو تەزمین - التضمين - ی سەرواناسی و ڕەوانبێژی لێ تێکەڵ بوو.

## زاراوەوچەمکی سەروا

زاراوەکە: ئەو زاراوەی لە زمانەئەوروپییەکان بۆ سەروا دانراوە، لە ئینگلیزی (Rime - Rhyme) و لەفەرەنسی (Reim) و لە ئەسپانی (Rima) و لە ئەڵمانی (Reim) و لە ئیتاڵی (Rima) و لە ڕووسیدا (Puopma)یە. هەمووشیان لەوشەی (Rhythmos)ی گریکییەوە هاتوون کە لە لاتینی بوە بە (Rhythmus) و دواتریش هەر لە لاتینی گۆڕاوە بۆ (Rithmi) کە بە ماناى ئاوی ڕووبار دێ. پاشان لەم وشەیە، وشەی (ritus) وەرگیراوە کە بە وپردو دوعا دێ. لە لاتینیدا (ritma) بۆ شیعری هێزدارو چەندی بەکار هاتوە، لە ئەڵمانی کۆندا (rim) بە کۆمەڵە کەسێ گوتراوە کە بە شێوەی بازنەیی وەستابن لە ڕۆمانیدا فیعلی (rimore) واتای ڕێکخستنی لە شێوەی زنجیرە دەدات. لە فەرەنسی کۆندا فیعلی (rimer) بە ماناى زنجیرە هاتوە [١]. وەك دیارە لە وزمانانەدا، ئەو وشەی پاشان بۆ دیاردەی سەروا بە کار براوە، پێشان بۆ ماناى هەڵچوونی ڕووبارو وپردو وەستانی بازنەیی و ڕێکخستنی زنجیرەیی و شتی وادەهات، ئەمەیش پەیوەندی بە قالبی سەرواو ئەرکەکانی هەیە. ئەو وشەی کە بۆ سەروا بەکار دێ زۆر لە وشەی (rhythm) نزیکە کە بە ماناى ئیقاع دێ. تا سەدەی حەڤدەم، ئینجا جیاوازی ئاشکرا لە نێوان - rhyme و rhythm دەرکەوت [٣٨، ل٣٧١] واتە هەریەکە چەمکیی زاراوەیی تایبەتی خۆی وەرگرت.

لە زمانی عەرەبیدا (القافيه) بۆ دیاردە شیعرییە بەکار هاتوە. ئەخفەش دەڵێ بۆیە (تیەکە پێی دەگوترێ - قافیە - چونکە شوێنی تیەکانی پێش خۆی دەکەوێ) [٣٠، ل١٥]. ئیبن ڕەشیق دەڵێ: (بۆیە پێی گوتراوە - قافیە - چونکە شوێنی هەموو دێرێك هەڵدەگرێ، هەندێ دەڵێن چونکە شوێنی هاوەڵەکانی دەکەوێ، لای من یەکەمیان پەسند ترە) [٢٩، ل١٥٤]. وشەکەیش وەك دیارە لە (قفا يقفو) هاتوە. قفا - ماناى پشتەملەو قفاالجبل - پشت چیایە. لە فەرموودەیەکدا هاتوە: (يعقد الشيطان على قافيه راس احدكم ثلاث عقد) [٢] [٣٤، ل١٧] لە فارسی و تورکیشدا وشە عەرەبییەکە خوازراوەو هەر قافیە بەکارهاتوە. کە بە ماناى شوێن کەوتن بەدوادا چوون دێ. دەنگەکانی سەروایش شوێن یەکتر دەکەون بۆیە بە یەکچوونێك هەیە لە نێوان ماناى فەرهەنگی و ماناى زاراوەیی وشەکە.

ئەم وشە عەرەبییە زۆرجار لە بواری لێکۆڵینەوەی شیعریدا بۆ چەمکی لە فراوانتر (لە تەدێرێك یان دێرێکی تەواویان سەراپای قەسیدەیەك بەکارهاتوە، زۆر جاریش بۆ چەمکی لە خۆی تەسکتر (تەنیا دەنگی ڕەوی) بەکاربراوە [٣٤، ل٢٢ - ٢٣].

لە کوردیدا زۆر ووشەی جیاجیا بۆ ئەم دیاردەیە بەکارهاتوە. لەمزووەوە هەر وشەی (قافیە)ی عەرەبی بەکارهاتوە. ئەمین فەیزی و شێخ نووری و جەمال عیرفان و ڕەفیق حلمی و گۆران و د. مارف خەزنەدر هەر قافیەیان بەکارهێناوە بە پێی ئاگاداری ئێمە یەکەم کەس عەلائەدین سجادی، ساڵی ١٩٦٧، زاراوەی (ساروا)ی لەباتی قافیە بەکارهێناوە.

بگەلەوە وشەی تریش بۆ سەروا بەکارهاتوە، محەمەد سەعیدی یبراهیمی زاراوەی (دواخشت)ی بۆ داناوە [٢٥، ل١٠٥]، پیربال بەحوودیش لە شیعرێکدا (کێش و لەنگەری) بۆ وەزن و قافیە داناوەو لە پەراوێزدا مانای ڕوون کردۆتەوە

## خامە ناتوانێ وێنەی بکێشێ
## بە گشت ئەندێشەو کێش و لەنگەرێ [٨، ل١٦٤]

وشەی سەروا، کە ئێمەلێرەدا بۆ دیاردەکە بە پەسندمان زانیوە، دەشێ بنچینەیەکی فارسی هەبێ دەشێ کوردییەکی ڕەسەن بێ.

وشەی (سروا، سرواد، سروادە) لە فەرهەنگە فارسییەکاندا بەم مانایەهاتوون: (قسە، ئەفسانە)، (شیعر، سروود، قسەی هۆنراو)، (شیعر، قافیەی شیعر) [٣٦]. دیارە وشەکە لە قسەو ئەفسانەو سروودو شیعرو ئینجا قافیەوە وەرگیراوەو کراوە بە زاراوە.

لە کوردیدا وشەی سەروا، ڕەنگە لە (سەرهۆ) هاتبێ کەزاراوەیەکی جوتیارییە. کۆتایی (دێرە جووت) دەگەیەنێ. دێریش هەر زاراوەیەکی جوتیارییەو بە مانای خەتە جووت دێ بۆیە زۆر لە گوینە بۆ کۆتایی دێرە شیعریش هەمان وشەی سەرهۆ وەرگیراێ و کورت کرایێتەوە بۆ سەروا. سەرهۆ لە دوو پارچە پێك دێ (سەر) کە لێرەدا بە مانای کۆتایی دێ، (هۆ) بە مانا سوورانەوەیە. هۆدانەوە: بادانەوەی جووتە لەسەرسەدەدا.

## چەمکی سەروا:

ئینسکلۆپیدیای بەریتانی لە بارەی سەرواوە نووسیویەتی: (ئەم دیاردەیە ئەو کاتە سەر هەڵدەدا کە دوو وشەیان زیاتر. ئەوانەی بڕگەی کۆتاییان وەکو یەکە، بە جۆری دابنرێن یەکی زایەڵەو دەنگدانەوەی ئەوەی تر بێ. سەروا لە لایەن شاعیرانەوە بەکاردێ، هەندێ جاریش لە لایەن پەخشاننووسانەوە، بۆ دەستەبەرکردن ئەو دەنگانەی سەرنجی خوێنەر بەکێش دەکەن و ستانزای شیعر دروست دە؟ن) [٣٩، ل٥٥٨]. لێرەدا دەنگی کۆتایی وشەکان وەکو یەك دانەناوە؛ بەڵکو بە زایەڵەو دەنگدانەوەی یەکتری داناون. فرێزەر لە پێناسەی سەروادا وردتر سنوورەکەی دیاردەکا: (دوو وشەی ئەو کاتە سەروادا دەبن کە بزوێنی سەرەکییان هێزدارێ و هەمان شت بێ و هەرنەبزوێنێکی لە دوای ئەوەوە هاتبێ یەك بن بەڵام نەبزوێنی پێش بزوێنە هێزدارەکان جیابێ) [٤٠، ل٦٠] فرێزەر ئەگەر چی وردتر بۆ دیارکردن سنووری سەروا چوە؛ بەڵام شوێنەکەی دیار نەکردوە سەروا ئەگەرچی دەشێ لە هەر شوێنێکی دێرە شیعرێ؛ بەڵام شوێنە سەرەکییەکەی بە کۆتایی دێر چەسپاو. لین و لیزلی لە باسی سەروادا ئەم خاڵەیان پشت گوێ نەخستوە: (دێرە شیعرەکان ئەو حەلە هاوسەروا دەبن کە کۆتایی دوا وشەیان دەنگی لە یەکچوو بێ. مەبەست لە کۆتایی وشە بزوێنی دوابڕگەی هێزدارو هەموو دەنگەکانی دواوەیەتی). [٤١، ل٣٠].

لە عەرەبیدا ئیبن کیسان ڕای خەلیل لە بارەی چەمکی سەرواوە وەردەگرێ: (قافیە ئەو تیپەیە کە شاعیر تا لە هۆنراوەکەی دەیهێنێتەوە لە کۆتایی هەموو دێرەکان دەیهێنێتەوە) [٣٠، ل١٥]. بەڵام زۆربەی زاناکان سەرواناسی ڕای دوەمی خەلیل پەسند دەکەن کە گوتوویەتی: (قافیە بریتییە لە دوا تیپی دێرەوە تایەکەم تیپی وەستاوی پێش ئەوو تیپی پێش وەستاوەکەش، یان سەرجەمی تیپە بزوێنەکانی نێوان هەردوو تیپی، وەستاوی کۆتایی دێر لەگەڵ ئەوەی پێش تیپی وەستاوی یەکەم) [٢٩، ل١٥١]؛ بەلای ئەخفەشەوە: (قافیە بریتییە لە دوا وشەو بەڵگە بەوە دێنێتەوە ئەگەر یەکێ پێت بڵێ هەندێ سەروام بۆ بێنە لەگەڵ ـ کتاب ـ بگونجێ، تۆ یەکسەر شباب ورباب ـی بۆ دێنی) [٣٣، ل٣٥]. کەچی قوتروب دەڵێ: (قافیە بریتییە لە تیپی ڕەوی.... چونکە دەگوترێ قافیەی دالی یان میمی) [٣٣، ل٣٦]. ئەبو مووسای حافیزیش دەڵێ: (قافیە ئەو تیپ و حەرەکانەیە کە شاعیر لە هەموو دێرێکا دووبارەیان دەکاتەوە) [٣٣، ل٣٦]. لەم بۆچوونانە ئەوانە لە زانستییەوە نزیکن کە جەخت لەسەر دووبارەکردنەوەی چەند دەنگێك دەکەن.

لەفارسیدا قەیسی ڕازی جۆرە چەمکی سەروا ڕوون دەکاتەوە: (سەروا بەشێکە لە دوا وشەی دێر بەو مەرجەی وشەکە وەکو خۆی و بەهەمان مانا لە کۆتایی دێرەکان تری هەمان هۆنراوە دووبارە ئەبێتەوە، چونکە ئەگەر دووبارە بێتەوە دەبێ بە ڕەدیف و سەروا دەکەوێتە پێش ئەوەوە) [٣٧، ل١٩٢]. دکتۆرە ئیسماد لە دیارکردن چەمك وسنووری سەروا جەخت لەسەر تیپی ڕەسەن وشەکان دەکات بەهەموش ڕەوی و پاش ڕەوی لە یەك دادەبڕێنێ کە ئەمە لەوانەی تر وردتر و زانستیترە[٣٢، ل٣٤٢].

لە کوردیدا، شێخ نووری لە پێناسەی سەروادا دەڵێ: (قافیە لە نیهایەتی هەموو مەسرەعێکدا لەبەینی هیجای ئاخیریدا بە ئیعتیباری تەسەووت عیبارەتە لە موتابەقەت) [٢٧]. لەم پێناسە کورتەدا چەند خاڵێك لە بارەی سەرواوە دیار کراوە: سەروا لە کۆتایی دێریان لەتە دێر دێ، بڕگە (هیجا) کراوە بە بنەمای دیارکردن سنووری سەروا، لە بارەی پەیوەندی بڕگەکان کۆتاییەوەش دەڵێ دەبێ دەق وەکو یەك وابن. دکتۆر مارف خەزنەدار لە پێناسەی سەروادا باسی وشەی کۆتایی دەکات کە (لە لایەن کێش و ئاوازەوە لە یەکتری ئەکەن، بەلای کەمی یەوە ئەبێ تیپی دوایی هەموو ئەو وشانەی دێرە شیعرەکان یەك بن. ئەم وشانە قافیەیان پێ ئەڵێن) [٢٣، ل٥٦]. لێرەدا بە وشەی کۆتایی گوتراوە قافیەو تەنیا یەك دەنگی کۆتایی (ڕەوی) بە مەرج دانراوە. عەلائەدین سجادی، لە (ئەدەبی کوردی و لێ کۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی) چەمکی سەروا بەم جۆرە لێك دەداتەوە: (ئەوەیە کە دوایی هۆنراوەکان لە چەند پێتێکدا وەکو یەك بن، ئەم وەکو یەك بوونە لە ڕاستەی پەخشانیشدا ئەبێت؛ ئەوەندە هەیە وەنەبێ

شتێکی پێویست ـ لازم ـ بێت، بە پێچەوانەی هۆنراو، بوونی لەودا پێویستە) [١٨، ل١٣٤] ولە:

(نرخ شناسی)دا یەکبوونی دوو دەنگی کۆتایی بە مەرج دادەنێ بۆ تەواو بوونی سەروا (بەلاں کەممەوە ئەبێ دوو پیتی دوایی. ... ئاوازەو دەنگیان وەك یەك وابن، ئەگەر جیابوو شێوەی سەروا نامێنێ) [١٩، ل١٠٣ ١٠٤]. سجادی لە بیری نەکردوە کە پەخشانیش بخاتە ناو لێکۆڵینەوەی سەرواناسی چونکە سەروا لە پەخشانیشدا هەیە، بەلاّم کە دوو دەنگە بە مەرجی سەروا دادەنێ ئەمە لە هەموو حاڵەتێکدا ناڕوا چونکە بزوێنی درێژ خۆی بە تەنیا دەتوانێ سەروا دروست بکا.

لەم بۆ چوونانەی سەرەوە دەگەینەوە ئەو ڕاستییە لە بارەی سەرواوە بڵێین بریتییە لە:

- دووبارە بوونەوەی یەك دەنگ یا زیاتر.
- دەنگە دووبارەبووەکان دەکەونە کۆتایی وشەی سەرواوەو دوادەنگی بەشی ڕەسەنی وشەی کۆتایی ڕەدیفە.
- وشە هاوسەرواکان بە زۆری لە کۆتایی لەت یان دێرە شیعر دووبارە دەبنەوە، ئەگەر چی وایش دەبێ لە ناوەوەی دێرە شیعر یان لەسەرەتاوە بێن بەلاّم کەمتر.
- وشە هاوسەرواکان دەبێ مانایان جودابێ چونکە ئەگەر وشەی کۆتایی بە هەمان مانا دووبارە بێتەوە دەبێ بەڕەدیف و سەروای لێ دروست نابێ.

## بەشی یەکەم
## دابەش کردنی سەروا لە ڕوانگەی ئاسۆییەوە:

سەروا، وەك ڕەگەزێکی بنیاتی شیعرو بەهێزکردنی مۆسیقیەت و دەلالەتی شیعر، لە ئەنجامی زۆر بەکارهاتن و دووبارە بوونەوەی دا لای شاعیرانی کۆن ونوێی سەرانسەری جیهان، زۆر جۆری لێ پەیدا بوە، ئەم جۆرانەش بەپێی سەردەم نەتەوەو شاعیرەکانەوە دەگۆڕێن. ئەگەر لە ڕوانگەی ئاسۆییەوە سەیری سەروا بکەین بەپێی گۆشەنیگای جیاجیاوە دابەش چەند جۆرێکی جیاواز دەکرێ، ئامانە هەندێکن لەو گۆشەنیگاو بۆ چوونانە:

### ١ - بەپێی پێکهاتنی وشەیی سەروا:

**أ- سەروای سەربەخۆ:** ئەوەیە لە کۆتایی دێریان لە تەدێردا تەنیا وشەی سەروا لە دەنگێ یا چەند دەنگێکی کۆتایی هاوبەش بن. بۆ نموونە مەولەوی دەڵێ:

ئازیز جە دووریت تەن بێ کلاّفە
ڕۆح بێ وەتەنوین حاڵی ئیزافە [٢٤، ل٥٩]

وشەکانی سەروا (کلاّفە ـ ئیزافە) لە سێ دەنگی کۆتایی (ـ افە) هاوبەشن و ڕەوی (ف)ە.

**ب - سەروای لێکدراو:** ئەوەیە دەنگە هاوبەشەکانی کۆتایی لە یەکێ یان لە هەردوو وشەدا، بەسەر دوو وشەی جیا دابەش بووبێ. ئەم جۆرە سەروایە لە ئینگلیزی پێی دەگوترێ (Mosaic Rhyme)، وەکو نالی دەڵێ:

ساقی بەمەیی کوهنە لەسەر عادەتی نەو بە
بشکێنە بەیەك نەوبە دوسەد ماتەمی تەوبە [٢٦، ل٩٢]

دەنگەکانی سەروای دوو وشەکە (ـ ەوبە) لە لەتی یەکەم دا بەسەر دوو وشەدا دابەش بوە (نەو ـ بە) کەچی لە دوەمدا لە یەك وشەدایە (تەوبە).

**جـ - سەروای تاجدار:** ئەوەیە دوو وشەکەی سەروا بە جۆرێ بن، یەکێکیان وەکو دووبارەبوونەوەی بەشی کۆتایی ئەوەی تریان بێ، ئەم جۆرە سەروایە وادەبێ سەروای کۆتایی بێ و وادەبێ سەروای ناوەوەبێ. لە سەروای کۆتایی نالی دەڵێ:

سابوونی کەفێ پێتە کەفی زاری چاپلووس [٢٦، ل٦٧]
خاسیەتی ڕەقی هەیە نەرمی زمان لووس

وشەکانی سەروا (چاپلووس ـ لووس) بە جۆرێ هاتوونّ. دوەمیان وەکو بەشی کۆتایی یەکەمیان دەکەوێتە بەرچاو.

**د - سەروای مورەددەف:** ئەوەیە جگە لە وشەی سەروا کە دەنگە هاوبەشەکانی لە کۆتاییدا هاتوە، ڕەدیف ـ پاش سەروا ـ یش هەبێ جا لە هەرچی ئاستێکدا بێ (وشە، دەستەواژە، ڕستە) (ناو، ڕاناو، کار، ئاوەڵکار...) بۆ نموونەی ئەم جۆرە سەروایە، نالی دەڵێ:

نەمردم من ئەگەر ئەمجارە بێ تۆ
نەچم شەرت بێ هەتا ئەم خوارە بێ تۆ [٢٦، ل٩١]

دەنگەکانی سەروا لە (ئەمجارە، خوارە) دایە کەوشەی سەروان. پاش سەروا بریتییە لە دەستەواژەی (بێ تۆ) کە لە هەردوو لەتدا بە هەمان مانا دووبارە بۆتەوە.

- **سەروای مەحجوب:** لەم جۆرە سەروایەدا پێش وشەکانی سەروا وشەیەك یان دەستەواژەیەك یاك ڕستەیەك وەکو خۆی بەهەمان مانا دووبارە دەبێتەوە. حاجی دەڵێ:

کوڕێکی وانەبوو هەستێتە سەرپێ
بزانی خەڵقی چۆن کەوتوونە سەر ڕێ [١٠، ل٢٣١]

پێش وشەکانی سەروا (پێ ـ ڕێ)، ئاوەڵکاری (سەر) لە هەردوو لەتدا وەکو خۆی دووبارە بۆتەوە. ئەگەر وشەکانی سەروا لابدرێن ئەو هاودەنگییەی لە دووپات کردنەوەی ئەم وشەیەدا دەست دەکەوێ

تارادەیەك قەرەبووی سەروا دەكاتەوە بەڵام ناشبێ بە سەروا.
- سەروای مەحجووب مورەددەف: ئەو سەروایەیە جگە لە وشەی سەروا، رەدیف و حاجبی تێدا هەبێ وەكو، خانی دەڵێ:

یەك ئەسمەرو یا دوی زەری بوو
یەك حوری بو یا دوی پەری بوو [٣، ل٣٦]

لەم دێرە شیعرەدا، وشەكانی سەروا بریتین لە (زەری، پەری). دێرەكە پاش سەروا (بوو)و پێش سەروا (یادوی) هەیە. بۆیە جۆری سەرواكە مەحجووب و مورەددەفە، واتە حاجیب و رەدیفی هەیە.
٢ - بەپێی ژمارەی سەروا لە ئاستی ئاسۆییدا:
شاعیر وادەبێ لە دێرە شیعردا هەرتەنیا بەسەروای كۆتایی واز بێنێ، وایش دەبێ جگە لەسەروای كۆتایی سەروای تریش دابمەزرێنێ كە لە دێرەكان یان لە لەتە دێرەكان بەرامبەریەك بوەستن. لەم ڕووەوە سێ جۆر سەروا هەیە:
أ - تاك سەروا: ئەوەیە شیعرەكە تەنیا یەك سەروای هەبێ. نالی دەڵێ:

ئەی شۆخی بێ نیازو كران نازو غەمزە سووك
تیژیی موژەت نیشانەی دڵ كون دەكا بە نووك [٢٦، ل٧٠]

لەم دوو لەتەدا سەروا تەنیا لەسەر (سووك - نووك) دەوەستێ. لە كۆتایی لەتەكان چەند وشەیەك لابدەی بەهیچ سەروای تر ناگەیت.
ب - جووت سەروا: لێرەدا، شاعیر هۆنراوەكەی لەسەر دوو سەروا بنیات دەنێ. سەروای كوتایی سەروایەكی تریش كە بە لادانی هەندێ وشەی كۆتایی دێرەكان یان لەتەكان دەردەكەوێ. زێوەر دەڵێ:

كێیە تا غەزای دەردوو غەما بێ مابێ
ئەوە هەر كوردە كە چاوی لە هەوا بێ وابێ [١٥، ل١٦]

(ما - وا) وشەی سەروان، رەوی (١)كۆی كردوونەتەوە، (بێ) پاش سەروایە. ئەگەر (ماین - وابێ) لەم دوو لەتە لابدرێ، شیعرەكە دیسان سەروای هەر دەمێنێ كە لەوشەی (غەمابێ - ەەوابێ)دایە. لێرەش (بێ) پاش سەروایە. ووشەكانی سەروا (غەما - هەوا)ن و ڕەوییەكەیان (ا)یە.
جـ - سەروای سێیانە: لەم جۆرەدا، شاعیر دێرە شیعرەكەی یان هۆنراوەكەی لەسەر سەروا دادەمەزرێنێ، پاش لادانی هەر سەروایەك، سەروایەكی تر قیت دەبێتەوەو جێگای پڕدەكاتەوە. خانی دەڵێ:

داداری و دەوڵەت و دیانەت
سەرداری و سەولەت وسیانەت [٣، ل٣٥]

سەروای كۆتایی لە وشەكانی (دیانەت - سیانەت) دایەورەوی (ت)ە، سەروای پێش ئەو لە (دەوڵەت - سەولەت) دایە، دیسان رەوی (ت)ە، سەروای سێیەم لە (داداری - سەرداری) دایەو ڕەوی (ی)یە.

٣ - بەپێی شوێنی وشەی سەروا لە دێرە شیعردا: سەروا بە پێی ئەو شوێنەی لە دێر یان لە لەتە دێر دێت دەكرێ بە سێ جۆر:

أ - سەروای كۆتایی: ئەمە لە هەموو جۆرەكانی تر باوترە. لەبەر ئەوەی سەروای ئاسایی هەموو شیعری ئەوەیە لە كۆتایی دێ، پێویست بە نموونە هێنانەوە ناكات.

ب - سەروای ناوەوە: ئەوەیە وشەكانی ناوەوەی لە تەدێر، لە بەینی خۆیاندا یان لەگەڵ وشەی كۆتایی هاوسەروابن، وەكو، نالی دەڵێ:

وە هەسە قیمی موجەززا عەوامیلی ئەجزا
كە ئالەتی عەمەلی نەحوی مەحوی سەحوی زەمیر [٢٦، ل١٣٩]

لە نیوەی یەكەم (موجەززا - ئەجزا) هاوسەروان - سەروا (زا)و ڕەویان (١)یە، لە نیوەی دوەمیشدا سەروا لەوشەكانی (نەحوی - مەحەوی - سەحوی) دایە كە هەموویان ڕەگەزدۆزی ناتەواون و تەنیا دەنگی یەكەمیان جیایە. . (ی) یەكان مۆرفیمی ڕێزمانین وئەركی ڕستەسازی دەبینن. بۆیە وشە ئەسلییەكان بریتین لە (نەحو - مەحو - سەحو). دەنگەكانی سەروا (سەحو)ن و ڕەوی (و)ە. لە هەردوو نیوەدێردا وشە هاوسەرواكان كەوتوونەتە ناو لەتەكانەوە، لە سەرەتاو كۆتایی نەهاتوون. لە شاعیرانی كورد جزیری لە هەموویان زیاتر پابەندی ئەم جۆرە سەروایەیە.
جـ - سەروای سەرەتا: لەم جۆرەدا هاودەنگییەكە دەكەوێتە پێشەوە، ئەمەیش دوو جۆرە:
● یا وشەكانی سەرەتا هەوسەروا دەبن. واتە دەنگە یان دەنگەكانی كۆتاییان یەگە دەبێ، ئەوەندە هەیە شوێنی سەرەوایان گرتوە، وەكو؛ خانی دەڵێ:

ئینكار بكەت ضەلالی موطلەق
ئیقرار بكەت ب صورەتی حەق [٣، ل١٠٤]

● یان ئەوەتە دەنگێ یان چەند دەنگێكی سەرەتای وشەكانی پێشەوەی لەتە دێرەكان یان دێرەكان وەك یەك دەبێ. ئیبراهیم ئەفخەمی هۆنراوەیەكی هەیە، هەموو دەنگەكانی ئەبجەدی بەكار هێناوە، چەند دەنگە ئەوەندە پارچەی هۆنیوەتەوەو هەر پارچەیەك چەند دێریكە، هەموو دێرەكانی هەر پارچەیێك بە دەنگێك دەست پێ دەكا. بۆ نموونە پارچەی دووەم هەموو دێرەكانی بە دەنگی (ب) دەست پێ دەكا وەكو:

بۆ دەستەو ستان گەرمێن چ كوێستان
بۆ قەلەندەران هاوین چ زستان
بە كەرناوێری بە كوڕتان فێرە
لای زالم ڕێوی، لای مەزڵووم شێرە
بەرد لە جێگەی خۆی قورس و گرانە

کوا ڕێزی ماڵێ وەك هەندەرانە [٥، ل٦٥]

هەموو دێڕەکان بەدەنگی (ب) دەستیان پێ کردوە.

٤ ـ بە پێی دوا دەنگی سەروا:

دوا دەنگی سەروا یان دێرە شیعری پێ دەبڕێتەوە، لە ڕووی پەیوەندی بەوشەی سەرواوە. یان بەشێکی ڕەسەنە لە بنیاتی وشەی سەروادا، جلوشەکە چ سادەبێ وچ ناسادە، یان زیادەیەکە و پێویستییەکی ڕێزمانی هێناویەتی. لەم ڕووەوە سەروا دەکرێ بە دووجۆر:
أ ـ ئەو سەروایەی کۆتایی بە (ڕەوی) دێ کە بەشێکە لەوشە ڕەسەنەکەی کۆتایی. قانیع دەڵێت:

چوار شتن ئەمرۆکە بوونە نەگبەتی کوردی هەژار
جەهل یەك، بێ ئەقڵی دوو، دڵ پیسی سێ، داوا چوار [٢٠، ل٨٥]

کۆتایی هەردوو لەت بەدەنگەکانی (ار)و بە ڕەوی (ر) هاتوە کە بەشێکی ڕەسەنە لە وشەکانی سەروا، واتە زیادەیەکی ڕێزمانی نیە.
ب ـ ئەو سەروایەی کۆتایی بە ڕەوی نایە، بەڵکو کۆتایی بە پاش ڕەوی یان پاش ڕەوی و پاش سەروا دێ. لە هەردووجاردا ڕەوی بەرەو پێشەوە دەخشێ و دەنگی تر جێی دەگرێتەوە کە کۆتایی لەت یان دێرە شیعرە.
ئەگەر دێرەکە کۆتایی بە پاش ڕەوی هاتبێ، وەکو حاجی دەڵێ:

دەزانی زەحمەتە تەعدادی یاران
بەصەد هاوین و زستان و بەهاران [١٠، ل٢٤٨]

وشەکانی سەروا لەم دوو لەتەدا بریتین لە (یاران، بەهاران)، (ان) زیادەیەکی ڕێزمانییە وەکو نیشانەی (کۆ) هاتوتە سەر وشەکان. وشە ڕەسەنەکان (یار، بەهار)ن، واتە ڕەوی (ر)یە. بەڵام لەم دێڕەدا ڕەوی نەکەوتوتە کۆتایی لەتە دێر، بەڵکو بەرەوپێش خزاوەو (ن)ی (ان)ی کۆشوێنی کۆتایی لێ داگیر کردوە، ئەمەش هەڵبەت لە نرخی ئیقاعی ڕەوی کەم دەکاتەوە.
● ئەگەر دێرەکە کۆتایی بە پاش ڕەوی و پاش سەروا هاتبێ، قانیع دەڵێ:

یاری من جیلوە فرۆشە دڵ غەمداری هەیە
سەری سەرپۆشی کەتانەو چاوی بە خوماری هەیە [١٠، ل٢٠٠]

لەم دوو لەتەدا، (هەیە) پاش سەروایە، (غەمداری، خوماری) وشەی سەروان، بەڵام (ی) کۆتایی لە هیچیکیان ئەسلی نیە، لە هەردووکیاندا ڕاناوی کەسی سێیەمی تاکە، کەواتە وشە ئەسلییەکان (غەمدار، خومار) ڕەوییان دەنگی (ر)یە. وەك دیارە ئەم ڕەوییە کە لە ئاساییدا دەبێ دوا دەنگی لەت یان دێربێ، لێرە بە دوو قۆناغ شوێنی خۆی بۆپێشەوە گواستۆتەوە، جارێکیان بە هۆی پاش سەروا (هەیە)و جارێکیش بەهۆی پاش ڕەوی (ی)وە. بۆیە ئەرکەکەی دوو چەندان کەم بۆتەوە، دەوری ئیقاعی کۆتایی کەوتۆتە سەر دوا دەنگی پاش سەروا.

٥ ـ بە پێی مەودای دەنگەکانی سەروا:

بە گوێرەی ژمارەی ئەو دەنگانەی لە کۆتاییدا سەروا دروست دەکەن، سەروا دەکرێ بە سێ جۆر:
أ ـ سەروای لاواز: ئەم سەروایە تەنیا لە یەك بزوێنی کورت و بێ هێز دروست دەبێ، جا لەبەر ئەوەی بزوێنی کورت باری سەروای پێ هەڵناگیرێ، ئەم جۆرە سەروایە بە یەکێ لە کەم و کورتییەکانی سەروا دادەنرێ، جزیری دەڵێ:

شێوەیی دلبەری پیران سونەتە شێوەعیشوە فەرض
هەردو ئەزمەر کوین قیران واجیبەیەك گرشمە فەرض [٢، ل٥٨٨]

ئەگەر پاش سەروا (فەرض) لابەری، وشەکانی سەروا (عیشوە، گرشمە) سەروایان تەنیا دەنگێکە (ڕەوی) ئەویش بزوێنی (ە)ی بێ هێزە.
ب ـ سەروای ئاسایی: ئەوەیە دەنگە هاوبەشەکانی وشەکانی سەروا، توانای ڕاگرتنی سەروایان هەبێ. لە کوردیدا سەروای ئاسایی بەم جۆرە خۆی دەنوێنێ:
ـ یان تەنیا یەك بزوێنی درێژە، وەکو ئەحمەدی خانی دەڵێ:

یەك قەیسی زەمانە، ئێك لەیلا
یەک واقیعی عەسرو ئێك عەزرا...

(لەیلا ـ عەزرا) تەنیا لە دەنگی (ا)ی کوتایی هاوبەشن کە ڕەوی دێرە شیعرەکەیە.
ـ یان ئەبزوێنی کۆتایی و بزوێنی پێشەوە، جاکورت بێ یا درێژ، وەکو قانیع دەڵێ:

ژیانە کەمی ژیانە؟ وەك کەوی بەندی قەفەس
ژێ کەی ڕافیزی بێ و دەسەی
پیاوی تەرەس [٢٠، ل١٤٥]

وشەکانی سەروا (قەفەس، تەرەس) بڕگەی کۆتاییان لە بزوێنەوە بە دواوەیەکە (ـ ەس).

جـ ـ سەروای زێدەبەر: ئەوەیە لە ڕادەی پێویستی خۆی دەنگی زیادەی تێدا ڕەچاوبکرێ بۆ پتەوکردنی ئاوازی هۆنراوەکە، ئەمە لە عەرەبیدا بە (لزوم مالایلزم) ناسراوەو ئەبو عەلای مەعەرری تێیدا دەست باڵا بوەو لە پاش ئەوەوە پەیرەو کراوە [٣١]. خانی دەڵێ:

ئـیـروهـە دەمـا کـو بـوونـە پـەیـدا
دیـنـن، تـەلـەسـن، جـنـوون و شـەیـدا [٣، ل٦٤]

لێرەدا سەروا چوار دەنگی کۆتایی گرتۆتە (ـ ەیدا) لە دوو وشەی (شەیدا ـ پەیدا) کە چی بۆ تەواو کردنی پێویستی سەروا (ا) بەس بوو، سێ دەنگەکەی پێش ئەمە (ەید) زێدە بارن. ڕاستە دەنگە زیادەکان ئاوازی شیعرەکە پتەوتر دەکەن بەڵام بارێکی قورسترە بە ئەستۆی شاعیرەوە. بە تایبەتی ئەگەر هۆنراوەیەکی درێژ بێ و یەکێتی سەروای تێدا پەیرەو کرابێ، ماندووبوونێکی زۆر دەخاتە بەر شاعیر بۆ هێنانی ئەم جۆرە سەروایە، چونکە تادەنگە هاوبەشەکانی کۆتایی زیاتر بن وشەی هاوسەروا کەمتر دەست دەکەوێ.
ئەم جۆرە سەروایە لە ڕەگەزدۆزیش دەردەکەوێ؛ چونکە لەوێ وشەکانی سەروا یەك شتن لە دەنگدا، دەنگەکانیش بەڕێژەی زیادەی پێویستی سەروا زیاترن، وەکو؛ خانی دەڵێ:

فـەرهـادم ئـەزو تـۆ بـوٚمـە . شـیـریـن
سـەیـلابێ سـەشـکێ جـوٚیـێ شـیـریـن [٣، ل١٤٨]

وشەکانی سەروا ڕەگەزدۆزیان لە نێودایە. هەمان دەستە دەنگە دووبارە بوٚتەوە بەڵام مانایان جودایە. تەنیا (ین) بەس بوو بۆ دروست کردنی سەروا بەڵام لێرەدا هەموو دەنگەکانی (شیرین) دووبارە بوونەتەوە. ئەمەش ئەگەر چی زێدەبارییە بەڵام جوانییەکی تر بە دێرەکە دەدا. واتە لایەنی جوانکاری قووڵ دەکاتەوە. بێگومان ئەگەر دوو وشەکە ڕەگەزدۆزی نەبان (مانایان جودا نەبایە)، نەدەبوون بە وشەی سەروا، دەبوون بە پاش سەروا سەروا دەبوایە لە وشەکانی پێش ئەوانەوە هەبێ.

٦ ـ بە پێی جۆری دەنگەکانی سەروا:

بە گوێرەی جۆری دەنگەکان، سەروا دەکرێ بە شەش جۆر:

أ ـ نیمچە سەروا ـ **half - rhyme** ـ ئەوەیە وشەکانی سەروا تەنیا دوا دەنگی نەبزوێنیان یەك بێ، بزوێنی پێش نەبزوێنەکەیان جیابێ کە پێویستیەکی بنچینەییە بۆ دروست بوونی سەروا. ئەگەر لە ڕوانگەی بڕگەوە بۆی بچین نیمچەسەروا ئەوەیە بڕگەکانی کۆتایی تەنیا دوا پەراوێزمان یەك بێ، ناوك و پەراوێزی پێشەوەیان جیابێ خانی دەڵێ:

خـەمـسـان هـەبـتـن ئـەلـیـێ غـالـیـب
لـەب تـەشـنـەیـێ عـیـشـق هـەردو جـانـیـب [٣، ل١٣٢]

سەروای ناوەوەی نێوان (لەب، جانیب) کە لە سەرەتاو کۆتایی لەتی دووەم هاتوون لە دەنگی نەبزوێنی کۆتایی (ب) دایە وبەس. بزوێنی پێشەوەیان جیایە (ە، یـ) ئەم جۆرە سەروایە زیاتر بە کۆنسۆنانس ( **consonance** ) ناسراوە، چونکە یەك نەبزوێن **consonant** بە تەنیا سەروای ڕاگرتوە کە لە ڕاستیدا بێ بزوێن سەروا دروست نابێ.

ب ـ بڕگەی سەروایانە ـ **parathyme** ـ ئەوەیە بڕگەی کۆتایی وشە سەرواداره‌کان تەنیا ناوکەکەیان (بزوێن) جیابێ. هەردوو پەراوێزیان وەك یەك بێ. خانی دەڵێ:

ئەسڵێ دی دینێ: ژ مەرگە قەڕ بوو مەحزاوی بەشەر ب شۆڕو
شـەڕبـوو [٣، ل٩٦]

سەروای ناوەوە لەوشەکانی (شۆڕ، شەڕ) دایە. ئەم دوو وشەیە تەنیا بزوێنیان جیایە، دەنگەکانی تری پەراوێزەکانیان یەکە (ش، ڕ).
جـ ـ سەروای ئاوەژوو ( **reverse rhyme** ): ئەوەیە بە پێچەوانەی سەروای ئاسایی لە بزوێنەوە بەرەو دواوە بکشێتەوە، بزوێن و پەراوێزی پێشەوەی نەك دواوەی وەکو یەك بن، وەکو (کەم ـ کەف) لەم دوو وشەیەدا (کە) هاوبەشە. کە بریتین لە بزوێن و پەراوێزی یەکەمی بڕگەکان، نالی دەڵێ:

ڕۆژ پـرە گـۆمـان لـەبـەر ئـەهارو جـۆگـەو هـاژەهـاژ
شەونیـیە خەومان لەبەر قرژال و بۆق و ژاوەژاو [٢٦، ل١٤٦]

سەروای ناوەوە لەوشەکانی (قرژال، ژاوەژاو) دایە. بڕگەی کۆتاییان ئەمانەن (ژاڵ ـ ژاو)، لەم بڕگەیەدا پەراوێزی یەکەم (ژ)و بزوێن (ا) وەکو یەکن.

د ـ سەروای پاژەیی ( **partial** ): ئەمە لەو وشانەدایە کە بڕگەی کۆتاییان بێ هێزبێ و بڕگەی پێش کۆتاییان بەهێز بێ. وەك پێویستییەکی سەروا دەبێ لەم حاڵەتەدا هەردوو بڕگە حیسابیان بۆ بکرێ. لە زمانە ئەورووپییەکان وەکو ئینگلیزی و فەرەنسی و ئیسپانی، لە بزوێنی بڕگەی بەهێزی کۆتاییەوە دەبێ هەموو دەنگەکان وەکو یەك بن ئەوان بەم جۆرە سەروایە دەڵێن سەروای فێمینیە (**feminine** ) [٤٢، ل٣٤]. بەڵام جاری واهەیە بە تایبەتی لە زمانی ئیسپانیدا دوای بزوێنی بڕگە بەهێزەکە نەبزوێنێك لەوشەکانی سەروا جیاواز بێ، ئەمە پێی دەگوترێ سەروای پاژەیی، وەکو (**sienes, eres** )، لە دوو بڕگەی کۆتایی (**enes -** ) دەنگی دوا بزوێنی بڕگە بەهێزەکە جیایە (**n, r**) [٤٣، ٣٢] ئەم دیارەیە لە عەرەبی و کوردیدا ئەو کاتە دەردەکەوێ کە ئەلفی تەئسیی لەوشەکانی سەروادا هەبێ. لەم حاڵەتەدا دەنگی دوای (ا)، کە پێی دەگوترێ (دەخیل) بۆی هەیە جیابێ و کەم وادەبێ یەك بێ. وەکو ئەم دێرە شیعرەی خانی:

ئـەو زەوق و جـەفـا ببـن مـوقـابـیـل
ئـەو سـیـدق و وەفـا ببـن مـوعـادیـل [٣، ل٩٩]

ئەم دێرە شیعرە، جگە لەوەی کە لەسەر سەروای سیبانە ڕۆنراوەو سێ ڕەوی یەك بە دوای یەکی هەیە (ق، ا، ل). وشەکانی سەروای کۆتایی (موقابیل، موعادیل)، ئەلفی تەئسیسیان تێدایە، ئەو ئەلفە لەبەر بە هێزی ئەگەر لە برگەی لە برگەی پێش کۆتایی وشەیەکی سەرواهات دەبێ لە وشەکانی تریش دا هەبێ ئەگەرنا سەرواکەی عەیبدار دەبێ. پاش ئەلفەکە لەم دوو وشەی سەرەوەدا، دەخیل لە یەکێکیان (ب)و لەوەی تر (د)ە. ئەگەر چی بەبێ ئەم ئەلفەش سەروا هەر هەیە (ـیل) بەلام کە نەبوو دەبێ لە هەردووکیاندا نەبێ.

هـ ـ سەروای کراوە: ئەوەیە کە بە برگەی کراوە (نەبزوێن + بزوێن) کۆتایی هاتبێ. یەساران دەڵێ:

چراغ، ئەر ساتێ دوور گنۆن جەتۆ
نەمانوون شەللا، بوینوون ئەورۆ [۷، ل۸۲]

(ماناکەی: ئەی یاری وەك چرا، ئەگەر من بێ و سەعاتێ لە تۆ دوور بکەومەوە، یا خوا هەر نەمێنم وهەر ئەو ڕۆژە بمرم).
سەروای هەر لەت بە برگەی کراوە کۆتایی هاتوە (تۆ، ـ ڕۆ).

و ـ سەروای داخراو: ئەو سەروایەیە کە بە برگەی داخراو (ـ نەبزوێن.) کۆتایی هاتبێ، حاجی دەڵێ:

لەبۆ ئەم یەك دوو ئەشعارەی ڕەش و ڕووت
هەتا پەیدا بوو، ڕۆحم گەییە لووت [۱۰، ل۲۳۰]

برگەکانی کۆتایی (ڕووت، لووت) بە نەبزوێن داخراون.
۷ ـ بە پێی دەنگەکانی پێش ڕەوی
ئەو دەنگانەی جگە لە (ڕەوی) لە کۆتایی دێر دێن و لەوشەکانی سەروادا دووبارە دەبنەوە سەروا دەکەن بەسێ جۆر:
أ ـ سەروای موردەف: ئەوەیە لە پێش ڕەوی ڕاستەوخۆ دەنگێکی بزوێنی درێژ هاتبێ وەکو (ا، وو، ۆ، ی. . .)، هێمن دەڵێ:

ڕێبوارێکم ئازاو بە زیپك و زاکوون
دەبڕم چۆڵ و چیاو پێدەشت و بیروون [۲۸، ل۱۷۷]

لەم دوو لەتەدا وشەکانی سەروا (زاکوون، بیروون) کۆتاییان بە ڕەوی (ن) هاتوەو پێش ئەم دەنگە بزوێنێکی درێژ (وو) هاتوە. ئەم بزوێنە پێی دەگوترێ (ریدف)و سەروای ریدفداریش پێی دەگوترێ موردەف.
ب ـ سەروای موسەمەت (مصمت): ئەوەیە پێش ڕەوی نەبزوێن، بزوێنێکی تری وەستاو هەبێ و بە هەردوکیان (هێشوە نەبزوێن ـ con- sonant cluster ) یەك پێك بێنن، وەکو لە وشەی(دەشت — گەشت)یان (بەرد — سەرد)دا دەردەکەوێ. خانی دەڵێ:

بێریتە، سەماوو سازو گوڵەند
شیرین و شەکەر لەب و شەکەر خەند [۳، ل۱۷]

وەکو دیار ئەم دوو لەتە دێرە بە وشەی سەروای (گوڵەند، شەکەرخەند) کۆتاییان هاتوە، برگەی کۆتایی وشەکانیش ئەمانەن (ڵەند ـ خەند)، هەردووکیان بە هێشوە نەبزوێنی (ند) کۆتاییان هاتوە. واتە پێش ڕەوی (د)، نەبزوێنێکی تر هاتوە ئینجا بزوێنی برگەکە. ئەمە لە فارسیدا پێی دەگوترێ (قەید).

ج ـ سەروای موئەسەس: ئەو سەروایە یە لەسەر دووبرگە دامەزرابێ، برگەی پێش کوتایی بزوێنەکەی (أ) بێ کە پێی دەگوترێ ئەلفی تەئسیس و دەبێ لە وشەکانی سەروادا، دووبن یازیاتر، پەیرەوبکرێ. دەنگی نەبزوێنی دوای ئەلفەکە، کە پێی دەگوترێ (دەخیل)، دەشێ پەیرەوی دووبارە بوونەوەی بکرێت و دەشێ بگۆڕێ. حاجی دەڵێ:

مەوقووفە بە ڕۆستەمی عینایەت
موحتاجە بە هیممەت و هیدایەت[۱۰، ل ۱۹۷]
د ـ سەروالی ڕووت (مجرد): ئەوەیە ڕەدیف و تەئسیس و هێشوە نەبزوێنی کۆتایی نەبێ، نالی دەڵێ:
یبە گوارە گوناهی وابە ستەق
بە گوێ هەڵتاوە سیوە سەر موعەللەق [۲٦، ل ٦۹]
۸ ـ بەپێی کێشی زەرب

بینای کێش و سەروا لەسەر زەرب دێ. لە شیعری کلاسیکی عەرووزیدا، زەرب کێشی خۆی هەیە کە لە دەنگی بزواو وەستاو پێك دێ و لە سەرەتاوە تا کۆتایی گۆڕانی بە سەردا نایە. جا بە پێی کێشی زەرب سەروا دەکرێتە پێنج جۆر:

أ ـ سەروای موتەرادیف: ئەوەیە کە کۆتایی بە دوو ساکینی تەك یەك هاتبێ. ئەم جۆرە سەروایە لەم تەفعیلە عەرووزیانەدا هەیە: (مفاعیلان، مفاعیل، فاعلان، فعلان، فاعلاتان، مستفعلان، فع لان، فعولان، فعول) ئەم تەفعیلانەش لە چەند قالبێکی کێشەکانی (هەزەج و رەمەل و مزاریع و موجتەس و بەسیت و موتەقاریب و خەفیف) دەبن بە زەرب، بۆ ڕوون کردنەوەی زیاتر بروانە [۱۷، ل۲۲۰ ـ ۲۲۲]. قانیع دەڵێ

ئەی کوزدی خەفەتبارو برینـدارو پەرێشان
ئەی میللەتی بێ پشت و بەبێ یاوەرو عوریان [۲۰، ل۱۵۸]

سەروای ئەم دێرانە لە زەربێکدان (فعلان) کە بە دوو ساکین کۆتایی هاتوە

ب ـ سەرواى موتەواتر: ئەو سەروايەيە کە زەربەکەى بە حەرەکەيەك و ساکينێك هاتبێ، ئەمەيش بەرامبەر بە سەبەبى سووك دەوەستێ و لە کۆتايى ئەم تەفعيلانەدا دێ: (مفاعيل، فعولن، فاعلاتن، فع لن) کە لە کێشەکانى (هەزەج و ڕەمەل و موزاريع موجەس و موتەقاريب)دا دێن [١٧، ل٢٢٠ ـ ٢٢٢]. هێمن بە (دايکى نيشتمان) دەڵێ:

چييە؟ چۆنە؟ لەبەرتۆدا جلى ڕەش
سەرو شان و ملت بۆ ناوەتە هەش [٢٨، ل٨٤]

سەرواى ئەم لەتە لە تەفعيلەى زەرب هايە کە لە (جلى ڕەش ـ وە تاهەش) دەرکەوتوو.

جـ ـ سەرواى موتەداريك:

ئەو سەروايەيە کە زەربەکەى بە دوو حەرەکە و يەك ساکين کۆتايى هاتبێ، واتە داو ڕوکنى وەتە دى کۆ (الوتد المجموع) بێ. ئەم جۆرە سەروايە لەم تەفعيلانەدا دەرکەوێ [مستفعلن، مفاعلن، فاعلن، فعل] کە لەم کێشانەدا هەن (ڕەجەز، موزاريع موجتەس و بەسيت، ڕەمەل، موتەقاريب) [١٧، ل٢٢٠ ـ ٢٢٢]. جزيرى دەڵێ

خەلقۆ لمن کەن شيرەتێ ئەو دلبەرا زەرڕبين کەمەر
من دى دحاڵى خەفلەتێ، هات دەر ژيورجێ وەك قەمەر [٢، ل١٣٠]

کێشى زەربەکان (وستفعلن)بەو سەرواکەيان کەوتۆتە وەتەدى کۆى (کەمەر، قەمەر).

د ـ سەرواى موتەراکيب: ئەوەيە ڕەويەکەى بە سێ حەرەکە و يەك ساکين کۆتايى هاتبێ، واتە بە فاسيلەيەکى بچووك يان سەبەبێکى گران و سەبەبێکى سووك. ئەم سەروايە لەزەربى تەفعيلەى (فعلن)يان (مفتعلن) دايە. بەڵام لە کورديدا بە زۆرى هەر لەگەڵ (فعلن)دێ کە لە کێشەکانى ڕەمەل و خەفيف و موجتەس و (ڕەجەز) دايە. خاديم دەڵێ:

شاهى گوڵ خێوەتى هەڵدا، لەبەهارا، لە چەمەن
کەوتە سەجدە بە قەدەميا چەمەن و سەر ووسەمەن [١١، ل١٨٩]

دێرەکە لەسەر کێشى ڕەمەڵى هەشتى مەخبوونى مەحزووفە؟ دوا تەفعيلەى لەسەر کێشى (فعلن) هاتوە (لەچەمەن ـ ووسەمەن).

هـ ـ سەرواى موتەکاويس: ئەمە لەزەربێك دا دێ کە چوار حەرەکەو يەك ساکينى هەبێ، واتە فاسيلەى گەورە بێ يان سەبەبێکى گران و وەتەديکى کۆبێ. ئەم سەروايە تەنيا لە تەفعيلەى موزاحەفى (فعلتن) دێ کە مەخبوولى (مستفعلن)ە، ئەم جۆرە سەروايە لە شيعرى کورديدا بەر چاونەکەوتوە.

### ٩ ـ بە پێى چالاکى ڕەوى:

دەنگەکانى زمان، هەرزمانێك، لە بوون بەڕەويدا چالاکييان وەکو يەك نييە. هەيانە زۆر چالاکە و بە زۆرى لە ڕەويدا دەردەکەوێ، هەيشيانە کەمتر دەورى ڕەوى دەگێڕێ. لە عەرەبيدا مەعەڕڕى هەر لەزووەوە هەوڵى داوە لە ڕێگاى جەردێکى نەختێ فراوان ڕادەى بەکار هاتنى دەنگەکان لە ڕەوى دەربخا، بەم پێيە سێ جۆر سەرواى لە يەك جيا کردۆتەوە: (الذلل) ئەوانەن کە زۆر دووبارە دەبنەوە، (النفر) ئەوانەن بە شێوەيەکى کەمتر لە وان پێشوو بەکاردێن، (الحوش) ئەوانەن کە زۆر بە دەگمەن لە شوێنى ڕەويدا دەردەکەون [٣١، ل٣٠]. لە کورديدا لە جەردێکى مەيلەو فراوان بۆمان دەرکەوتوە کە شەش جۆر سەروا هەن:

١ـ ئەو سەروايانەى ڕەويەکانيان زۆر دووبارە دێتەوە، وەکو:
(ن، ڕ، ا).
٢ـ ئەو سەروايانەى ڕەوييەکانيان بە شێوەيەکى ئاساى دووبارە دەبێتەوە (نەزۆر نەکەم). وەکو:
(ت، ل، ى. م، د، و، ب).
٣ـ ئەو سەروايانەى ڕەوييەکانيان کەم دووبارە دەبێتەوە. وەکو:
(ز، ش، ك، س، وو، ى، ق، ۆ)
٤ـ ئەو سەروايانەى زۆر کەم ڕەوييەکانيان دووبارە دەبێتەوە، وەکو:
(گ، ج، ف، ژ، غ، هـ، ح، خ،)
هـ ـ ئەوانەى بە دەگمەن بەکاردێن: (ە، چ، ڤ، ص، ض، ط، ظ، ێ، پ، ث، د)
و ـ ئەوەى بەکار نەهاتوە (ذ).
(تێبينى: ئەم ئەنجامە لەسەر ژمێرييەکى گشتى ـ ٦٤ ـ ديوانى شيعرى کلاسيکى کوردى دەست کەوتوە).
٤١م٢

## بەشى دووەم
## دابەش کردنى سەرواله ڕوانگەى ستوونييەوە

ئەگەر لە ڕوانگەى ستونييەوە سەرواکانى هۆنراوە شى بکەينەوەو بەراورديان بکەين، دەتوانين لە. هەندێ گۆشەنيگاى جيا جياوە پۆلينيان بکەين:

### ١ـ بە پێى لايەنى وشەيى:

ئەگەر بەستوونى وشەکانى سەروا لەگەڵ يەکتر بەراورد بکەين، دەتوانين پيکەين بەم چوار جۆرە:

أ ـ سەرواى ڕەگەز دۆزى: ئەوەيە وشەکانى سەروا شکڵيان يەك بێ

بەڵام مانایان جیابێ، (ئەمە لە ئاراستەی ئاسۆیش دەکەوێتە بەرچاو). بەڵام بە زۆری لە مەسنەویدا دەبێ یان لە سەرەتای هۆنراوەکە تصریعی تێدایەو دێری یەکەم وەکو مەسنەوی خۆی دەنوێنێ .لەم جۆرە سەروایەدا، وەکو حاجی دەڵێ:

ئافتابی حوسنی تۆ ڕۆژەکە دێ و ئاوا دەبێ
قامەتیشت وەک هیلالی یەک شەوە ئاوا دەبێ[١٠، ل١٥٠]

وشەکانی سەروا (ئاوا)هەرجارەی مانایەکی هەیە، ئەمەش ڕەگەزدۆزی تەواوە

ب ـ سەروای هەڵگەڕاوە: ئەوەیە وشەکانی سەروا، دەنگەکانیان پاش و پێش بوون. لە هەندێ زماندا بەم هەڵگەڕانەوەیە ڕەوی دەگۆڕێ، وەکو لە ئینگلیزیدا، فریزەر بۆ ئەم جۆرە سەروایە ئەم وشانەی داوە (dab - bad - crab - brak - mate - tame) [٤٠، ل٦٣]. کە چی لە کوردیدا ئەگەر وشە بەم جۆرە هەڵبگەڕێتەوە سەروای لێ دروست نابێ؛ بەڵام وادەبێ هەندێ لە دەنگەکانی سەرەتاو ناوەتاو ناوەڕاست جێیان بگۆڕێ بە مەرجێ دەنگەکانی سەروا هەروەکو خۆیان بێننەوە. نالی دەڵێ:

قەترێکە لە بەحری کەرەم و ڕەحمەتی (فتاح)
نەک عارەقی کەرمی عینەب و شەربەی (تفاح) [٢٦، ل٦١]

(فتاح، تفاح) کەوشەی سەروان، عەرەبین و بەم جۆرە نووسینە عەرەبییە جێگای تیپی یەکەم و دوەمیان گۆڕاوە. بەڵام دەنگەکانی سەروا (ـ اح) هەروەکو خۆیان ماونەتەوە.
جـ سەروای هاو ئاواز: ئەوەیە وشەکانی سەروا، جگە لە بەشداری بوونیان لە دەنگەکانی سەروا، ئاوازەیان یەك بێ، یەکێتی ئاوازەیش لە یەکێتی دەنگە بزوێنەکانەوە دێ: بۆ نموونە (بەردارە، ئەندازە) هاو ئاوازەن چونکە بزوێنەکانیان بە ڕیز یەك لە دوای یەك بەرامبەر یەکتر وەکو یەك وان (ە، ا، ە). قانیع دەڵێ:

ئەمشەو کە بەختم هاتە سەر، شیرین جەماڵێ وەك قەمەر
فنجان مەم قەد نەیشە گەر پرسی لە وەزعی من خەبەر [٣٠، ل٨٦]

وشەکانی سەروا (قەمەر، خەبەر) هاو ئاوازەن. لەم هۆنراوەیەدا چەند وشەیەکی تریش وەکو ئەمانەن لە ئاوازدا (سەمەر، خەتەر، کەدەر، فەنەر، چەمەر).
ـ سەروای ناجۆر: ئەوەیە کە وشەکانی سەروا هیچ پەیوەندییەکی ڕەگەزدۆزی، هاوئاوازەیی یان ئاوەژوویان لە نێودا نەبێ، وشەکان لەم بارەیەوە تەواولە یەك جیابن. تەنیا ئەوەندەیە سەروایان یەك بێ. هێمن دەڵێ:

ئەی کچی جوان، کچی لەبار
ئەی کچی زاناو خوێندەوار [٢٨، ل١٥٧]

وشەکانی سەروا (لەبار، خوێندەوار) ئاوازەیان یەك نییە.

٢ـ بەپێی سیستەمی دووبارەبوونەوە:

سەروا بە یەك لەت (لە حالەتی مەسنەوی)و بە یەك دێر (لە حاڵەتی هۆنراوە)دا دروست نابێ. دەنگی یان چەند دەنگەکەی کۆتایی وشەی لەت دێر دەبێ لە لەت یان لە دێری تر دووبارە بێتەوە ئەوسا دەبێ بەسەروا دووبارە بوونەوەی سەروا بە زۆر سیستەم دەبێ. گرنگترینیان ئەمانەن:

أ ـ سەروای مەسنەوی: ئەوەیە دوو لەت هاوسەروابن و سەرواکەیان پەیوەندی بە سەروای دێرەکانی ترەوە نەبێ وەکو مەولەوی دەڵێ:

پەنج بیەن وە شەش، شەش ڕوو کەرد نە پەنج
حەریر نەما بەین گەوهەر سەنج (٣٤، ل١١٣)

ئە دوو لەتە سەروایان (ـەنج) و ڕەوییان (ج)ە، شیعری زاری گۆرانی هەمووی (کەمێکی زۆر کەمی لێ دەرچێ) و چیرۆکە شیعرییە درێژەکانی وەکو مەم و زینی خانی و شیرین و خوسرەوی خانای قوبادی و هەموو چیرۆکە ئیسلامی و چیرۆکەکانی شانامە کە کراون بە کوردی و بە شیعر داڕژاون، بەم جۆرە سەروایە هۆنراونەتەوە.

ب ـ یەکێتی سەروا: ئەوەیە کە هۆنراوەیەك، دێرەکانی هەر چەندە زۆر بێ، هەمووی لەسەر یەك سەروا بڕوات، ئەمە لە غەزەل و قەسیدەو قیتعەدا پەیڕەو دەکرێ. ئەمە هەموو شیعری شاعیرە کلاسیکیەکانمان دەگرێتەوە کە بە قالبی غەزەل و قەسیدە هۆنیویانەتەوە، بۆیە پێویست بە نموونە هێنانەوە ناکات.

جـ ـ سەروای موتەناویب: ئەوەیە لەت نا لەت سەروایان یەك بێ. وەکو لە هەندێ چوارینەو شەشینەدا هاتوە. قالبەکەی بەم جۆرەیە: (AB AB AB)؛ گۆران دەڵێ:

بەڕەنگی زەردو شێوەی دەست و شمشاڵی کزا، دەروێش
——— A
حەزم کرد بەستەیەک بیەم سەراسەر حوزن و ماتەم بێ ———
B
لە سیماتا بە دیم کرد هەیکەلی عومرێکی حەسرەتکێش ———
A
ماوێتی

# ڕێبەری هونەرمەندانی کورد

## عەبدوڵا جەمال ئەشرەف



* له بەرواری ١٩٦٨/١/١ له شاری سلێمانی له دایك بووه.
* له ساڵی (١٩٨٣) بووه به ئەندامی تیپی مۆسیقای منالآنی پیرەمێرد له سلێمانی، وەکو کەمانچەژەن و چەند گۆرانی یەکی منالآنی لەگەڵ ئەم تیپەدا له تەلەفیزۆنی کەرکوك پێشکەش کردووه.
* له ساڵی (١٩٨٥) بووه به ئەندامی تیپی مۆسیقای سلێمانی، وەکو کەمانچەژەن و بەشداری تۆمارەکردنی ژمارەیەك له بەرهەمەکانی ئەم تیپەی کردووه بۆ تەلەفیزۆنی کەرکوك.
* له ساڵی (١٩٨٧ - ١٩٨٨)بەشی مۆسیقای له پەیمانگەی هونەره جوانەکانی سلێمانی تەواوکردووەو به پلەی یەکەم دەرچووه. هەروەها بەشداری ڤیستڤاڵەکانی ساڵآنەی بەشی مۆسیقای له پەیمانگەی ناوبراودا کردووه.
* لەساڵی (١٩٩٠)دا بەشداری دامەزراندنی ئورکسترای سلێمانی کردووەو جەند دانراوێکی مۆسیقای کلاسیکی نوێ لەگەڵ ئەم تیپەدا پێشکەشي کردووه، وەکو پارچە مۆسیقای (ماملێ)و (یادگارێك).
* له ساڵی (١٩٩١)دا بووه به ئەندامی تیپی سەمفۆنیای عیراقی و وەکو کەمانچەزەن بەشداری ژمارەیەك له ئاهەنگەکانی ئەم تیپەی کردووه.
* له ساڵی (١٩٩٢)دا دانراوێکی نوێ بەناونیشانی (بەهار) لەگەڵ تیپی سەمفۆنی عیراقی دا پێشکەش کردووه.
* له ساڵی (١٩٩٣)دا دانراوێکی تری به ناونیشانی (هەناسەیەك لەنیشتمان)ی لەگەڵ تیپی سەمفونیای عیراقی دا پێشکەش کردووه.
* له ساڵی (١٩٩٣) بەشداری دامەزراندنی کۆمەڵەی مۆسیقای کلاسیکی کردووه لەبەغداو وەکو کەمانچەژەن و دانەر کاری تێداکردووه.
* له ساڵی (١٩٩٣ - ١٩٩٤) خوێندنی بەشی مۆسیقای کۆلێژی هونەره جوانەکانی زانکۆی بەغدای تەواوکردووەو به پلەی یەکەم دەرچووه.
* له ساڵی (١٩٩٥)دا دانراوێکی تری لەگەڵ تیپی سەمفونی عیراقی دا پێشکەش کرووەو ئامێری سەنتوری تێدا بەکار هێناوه بۆ یەکەم جار له عیراقدا و سودی له ئاوازی گۆرانی یه فۆلکلوری یەکان وەرگرتووه.
* تیپی سەمفونی عیراقی و کۆمەڵەی مۆسیقای کلاسیکی بەغدا گەڵێك جار دانراوەکانی هونەرمەیان له ناوەو له دەرەوەی عیراق دا پێشکەش کردووه.
* ئێستا هونەرمەند خەریکی ئامادەکردنی نامەی ماستەره لەسەر «پێك هاتووەکانی گۆرانی فۆلکلوری کوردی له ژێر تیشکی شی کردنەوەی ئەتنۆمۆزیکۆ لۆژیادا»، له بەشی مۆسیقای کۆلێژی هونەره جوانەکان له زانکۆی بەغدا. هەروەها مایسترۆی دووەمی تیپی سەمفۆنیای عیراقه.
* هەروەها له پرۆژە هونەرییەکانی ئایندەی که ئێستا ئامادەن بۆ چاپ:

- کتێبێك به ناوی الف و بی موسیقا بۆ منداڵان و نەوجەوانانی کورد.
- پرۆژەی وەرگێران دانانی چەند کتێبێکی هونەری دەربارەی مۆسیقاو به تایەتی مۆسیقای کوردی.

● ئازاد گەرمیانی



دار الحرية للطباعة
بەغدا: وەزیری یە - نزیك - المعهد القضائي - س. پ ٣٩١٠٧
نرخی (١٥٠) دینارە

